ڕۆمان

کورس بابائی

# ئەمشەو فرمێسکێک دەڕژێت



وەرگێڕان: کوێستان صاڵح

ناوی کتێب: ئەمشەو فرمێسکێک دەڕژێت
بابەت: ڕۆمان
نوسین: کورس بابائی
وەرگێڕان: کوێستان صاڵح
تایپ: وەرگێڕ
دیزاین: هەرێم عوسمان
تیراژ: (٢٠٠٠) دانە
بڵاوکراوە: گۆڵدن بووک
چاپ: چاپخانەی چوارچرا
نرخی ٣٠٠٠ دینار

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (١٩٩٧)ی ساڵی ( ٢٠١٢)ی پێدراوە

**بەهمەنی ئازیز،**

کچ تەنیا یەک دڵی هەیە و ئەگەر بەکەسێکی بدات

هەرگیز ئەو دڵە نابێتە هی کەسیتر.

دڵی منیش بەوشێوەیە.

## ١

لەدووایین خولەکەکانی کێشکی شەوانە، کەسێک بەتەلەفۆن ئاگاداری کردمەوە لەشەقامی سپەند کەسێک کوژراوە، دواتر بێ ئەوەی ڕوونکردنەوەی زیاتر لەمبارەوە بدات، تەلەفۆنەکەی داخستەوە. دەستبەجێ بەتەلەفۆن لەبنکەی پۆلیسی گەڕەکەکە سەبارەت بەو ڕووداوە پرسیارم کرد و ئەوان پشتڕاستیان کردەوە. بەخێرایی لەگەڵ وێنەهەڵگری ڕۆژنامە بەترۆمبێل بەمەبەستی ئامادەکردنی هەواڵ ڕۆشتینە شوێنی ڕووداوەکە. لەگەڵ ئەوەی هێشتا ڕۆژ نەبووبوویەوە، ژمارەیەکی زۆر کەتازە لەخەو هەستابوون، لەبەردەم ئەو ماڵەی کەسەکەی تیاکوژرابوو، کۆبووبوونەوە و سەبارەت بەم تاوانە گفتوگۆیان دەکرد. بەخێرایی بەهۆی یەکێک لەدراوسێکانەوە ئاگاداربوومەوە کەدەڵێن پیاوێک ژنەکەی کوشتووە و هەڵاتووە.

لەم کاتەدا ترۆمبێلی فریاکەوتنی پزیشکی دادوەری هاتەشوێنی ڕووداوەکە و دوای ئەو ترۆمبێلی لێکۆڵەریش

گەیشت. لێکۆڵەر لەگەڵ پۆلیس و پزیشکی دادوەری ڕۆشتنە ناو ئەو ماڵەی تاوانەکەی تیا ئەنجامدرابوو. چەند ساتێک دواتر منیش ڕۆشتمە ناو ماڵەکە. هەرچەندماڵەکە لەشەقامەکانی باکووری شاردا بوو، بەڵام ماڵێکی گەورە و خۆش نەبوو، لەناوەڕاستی ماڵەکە جەنازەی ژنێک لەسەر لا کەوتبوو، شوێنەواری شینبوونەوە لەسەر مل و چەند شوێنێکی جەستەی دەبینرا. ساتێک دواتر پزیشکی دادوەری پشکنینی بۆ جەستەی ژنەکە کرد و ڕایگەیاند ژنی ئاماژەپێدراو دوای دەرگیری و هەوڵێکی زۆر بۆ ڕزگارکردنی خۆی خنکاوە و بکوژ لەکاتی خنکاندنی ژنە گەنجەکە، هەموو هەوڵەکانی ژنەکەی بۆ زیندوو مانەوە، پووچەڵ کردۆتەوە. بەپێی وتەکانی پزیشکی دادوەری، بۆنی مەشروب لەدەمی کوژراوەکە دەهات و نیشانەی ئەوە بوو، کوژراو مەست بووە.

دوای وتەکانی پزیشکی دادوەری، لێکۆڵەر، لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیری بۆ ڕوونکردنەوەی هۆکاری کوشتنەکە دەستپێکرد و لەبەر ئەوەی بکوژ هەڵاتبوو، لێکۆڵەر، لێکۆڵینەوەکانی لەدراوسێکانی ئەم ڕووداوە دەستپێکرد. چەند کەس لەدراوسێکان بەلێکۆڵەریان ڕاگەیاند کوژراوەکە ناوی شەهلایە و لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکەی لەم ماڵەدا ژیانی بەسەر بردووە. منداڵەکەی ڕۆژی پێشتر بەهۆی کەمتەرخەمی دایکی کەوتە ناو

حەوزەکە و خنکا و هاوسەرەکەی شەهلا لەسەفەرە. بەڵام ژنێک کەدراوسێی دیوار بەدیواری شەهلابوو، بەلێکۆڵەری ڕاگەیاند شەوی ڕابردوو (بەهمەن) هاوسەری کوژراو لەسەفەر گەڕابوویەوە و ئەو چەند خوولەک پێش ڕووداوەکە، دەنگی شەڕ و هەرای نێوان ئەو ژن و مێردەی بیستووە. ئەم ژنە، دواتر زیادی کرد لەو کاتەوەی ئەم ژن و پیاوە هاتوونەتە ئەم گەڕەکە، بەزۆری کێشەیان بووە و ئەگەری هەیە بەهمەن بەرەبەیانی ئەمڕۆ، لەبەر ئەم کێشانە ژنەکەی کوشتبێت. لەو ساتانەی لێکۆڵەر، کۆتایی بەلێکۆڵینەوە لەدراوسێکان دەهێنا، لێپرسراوانی ئاسایش، لێکۆڵەریان ئاگادار کردەوە کە بەهمەن، هاوسەری کوژراو، خۆی بەبنکەی پۆلیس ناساندووە و لای ئەفسەری کێشک دانیناوە بەوەی شەهلای ژنی خنکاندووە بەڵام سەبارەت بەهۆکاری کوشتنەکە هیچ وەڵامێکی نەداوەتەوە.

بەدوای ئەم زانیارییە، لێکۆڵەر فەرمانی گواستنەوەی جەنازەکەی بۆ پزیشکی دادوەری دەرکرد و ساتێک دواتر جەنازەی شەهلایان لەناو قەرەباڵغی و دەنگەدەنگی ئامادەبووانی بەردەمماڵەکە بەترۆمبێلی فریاکەوتن بۆ پزیشکی دادوەری گواستەوە. پۆلیسەکان بڵاوەیان بەخەڵک کرد و لێکۆڵەر بەمەبەستی لێکۆڵینەوە لەکوژرانی شەهلا بەرەو بنکەی پۆلیس بەڕێکەوت.

لەسووچی ژووری ئەفسەری کێشک، لەسەر کورسییەکی دارین، گەنجێکی قۆز، کەنیگەرانی و ناڕەحەتی لەڕوخساری دەباری و دەستبەندی ئاسنین بەدەستەکانیەوە دەبینرا، دانیشتبوو. لەگەڵ گەیشتنی لێکۆڵەر بەمەبەستی ڕێزگرتن لەشوێنەکەی هەستا و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، دووبارە دانیشتەوە. ئەفسەری کێشک لەگەڵ پێدانی وەرەقەی لێپرسینەوە بەلێکۆڵەر، وتی: تاوانبار دانی بەکوشتنی ژنەکەیدا ناوە و کەمترین ڕوونکردنەوەی سەبارەت بەئەنجامدانی ئەم تاوانە نەکردووە و لەهەموو قۆناغەکانی لێپرسینەوە، بێدەنگی هەڵبژاردووە. لێکۆڵەر دوای وەرگرتنی وەرەقەکانی لێپرسینەوە لەئەفسەری کێشک، ڕۆشتە ژوورێکی دیکە و فەرمانیدا بەهمەنیش ببەنە ئەو ژوورە.

ماوەی یەک کاتژمێری بەردەوام لێکۆڵەر، لێکۆڵینەوەی لەگەڵ ئەو گەنجە کرد بەڵام ئەو بەدرێژایی ئەو ماوە تەنیا دەیوت من هاوسەرەکەم کوشتووە و هیچی دیکەم نییە بیڵێم. پێداگرتنی لێکۆڵەر بۆ هێنانەقسەی گەنجەکە سوودی نەبوو و سەرئەنجام کاتێک هەستی بەوە کرد لەبەر چەند هۆکارێکی تایبەت ئەم گەنجە ئامادە نییە قسە بکات، فەرمانیدا بۆ زیندانی دادگا بیگوازنەوە.

دوای ئـەم فـەرمـانـە، لێکۆڵەر بنکەکەی بەجێهێشت و لێپرسراوانی پۆلیس، تاوانباریان بەترۆمبێلی تایبەت بەرەو زیندانی دادگا برد لەکاتێکدا هێشتا دەستبەندەکانی بەدەستەوە بـوو. چەند خولەک دواتـر ئـەویـان تەسلیم بەلێپرسراوانی زیندانکرد.

من دوای ئامادە کردنی وێنە و هەواڵی کوشتنەکە بۆ ڕۆژنـامـە گـەڕامـەوە و لەکاتێکدا هێشتا بیرم لـەم ڕووداوە کارەساتبارە دەکردەوە، هەواڵەکانم ڕێکخست و بۆچاپکردن تەسلیمی سەرنووسەرم کـرد. لەگەڵ ئەوەیشدا سەبارەت بەبارودۆخی تاوانبار و بێدەنگی ئەو لەبەرابەر پرسیارەکانی پۆلیس و وتەی دراوسێکان سەبارەت بەهۆکاری کوشتنەکە، ڕوونکردنەوەی پێویستم نووسی و بۆ ئێوارێ لەڕۆژنامەکەدا چاپ و بڵاو کرایەوە.

تامەزرۆ بووم بەدواداچوون بۆ هۆکاری ئەم تاوانە بکەم چوونکە پێشتر کەس بەم ڕاشکاوییە دانی بەتاوانەکەیدا نەنابوو بێ ئەوەی باسی هۆکارەکەی بکات. لەو چەند جار پەیوەندییەی لەگەڵ لێکۆڵەرەدا گرتم وتی: بەداخەوە هەرچەند چەندجارێکی دیکە لێکۆڵینەوەم لەگەڵ ئەو گەنجە کـردووە بـەڵام هێشتا سەبارەت بەهۆکاری کوشتنەکە هیچی نەهێناوەتە سەرزمان و تەنیا وتەی دراوسێکان هاوپێچی دۆسیەکەی کراوە و لەبەر

ئەوەی ئامادە نییە چۆنیەتی ڕووداوەکە بگێڕێتەوە، دۆسیەکەی بۆ دادگا دەنێرم تا لەوێ ڕاستییەکان دەرکەوێت.

بەمشێوەیە چەند مانگێک بەسەر ئەو ڕووداوە تێپەڕی. ڕۆژێک بەیانی وەک پیشەی هەمیشە کاتێک دەڕۆشتم بۆ ڕۆژنامە، سەرنووسەر ئاگاداری کردمەوە کەدادگایی کردنی بەهمەن بەم نزیکانە دەستپێدەکات و تۆ بەپێی تامەزرۆیی خەڵک بۆ ڕوونبوونەوەی هۆکاری ئەم مەرگە ئاڵۆزە، دەبێت ئەوەی لەدادگا ڕوودەدات، بنووسیت و ئامادەی بکەیت بۆ ئەوەی لەڕۆژنامەکە چاپ و بڵاوی بکەمەوە. بەڵێنم بەسەرنووسەری ڕۆژنامەکەدا ئەو کارە بکەم و لەبەر ئەوەی خۆیشم حەزم دەکرد بزانم هۆکاری ئەم کوشتنە چییە کەبکوژەکەی جیاوازە لەبکوژەکانی دیکە. لەبەر ئەوە زۆر بەوردی چاودێری ڕۆژی دەستپێکردنی دادگاییەکەم دەکرد تا ئەوەی ئاگادار بوومەوە ڕۆژی شەممەی هەفتەی داهاتوو، دادگایی کردنی بەهمەن لەیەکێک لەهۆڵەکانی دادگای تاوان دەستپێدەکات.

ڕۆژی شەممە دادگایی بەهمەن دەستپێکرد و بەهەمانشێوە کەپێشبینی دەکرا، یەکەم دانیشتنی دادگا زیاد لەڕادە قەرەباڵغ بوو و لەدانیشتنەکانی دواتر هەرجارەو ژمارەیەکی زۆرتری خەڵک ئامادەی دانیشتنەکە دەبوون بەڵام بەهمەن لەتەواوی ئەم دانیشتنانە بێدەنگی هەڵبژارد تا ئەوەی دادگا دوای سێ

دانیشتن ڕایگەیاند بەیانی کۆتا دانیشتنی خۆی بەڕێوە دەبات بۆ ئەوەی بڕیاری کۆتایی سەبارەت بەتاوانبار بدات.

بەیانی ڕۆژی دواتر لەبەر ئەوەی دەمزانی کۆتا دانیشتنی دادگایە و ئەم دانیشتنە زیاد لەڕادە قەرەباڵغ دەبێت، زووتر لەڕۆژانی ئاسایی ڕۆشتمە ڕۆژنامە و جگە لەسەرنووسەر و چەند فەرمانبەرێکی دیکە، هێشتا ئەوانی دیکە نەهاتبوون. ڕووداوەکەم بۆ سەرنووسەر باسکرد و ئەوسا لەگەڵ وێنەهەڵگرەکە بەرەو هۆڵی دادگا بەڕێکەوتین تا لەکۆتا دانیشتنی دادگا بەشداری بکەم.

کاتێک گەیشتمە بەردەم دەرگای هۆڵی تاوانەکان، قەرەباڵغییەکی زۆرم بینی کەبەهۆی نەبوونی جێ، لەپشت دەرگاکانەوە مابوونەوە. لەناو قەرەباڵغییەکە تێپەڕین و هاوڕێ لەگەڵ وێنەهەڵگر ڕۆشتینە ناو هۆڵەکە و لەکورسییەکانی پێشەوە کەپێشتر بۆ ڕۆژنامەنووسان و پەیامنێران ئامادەکرابوو، دانیشتم.

هۆڵەکە لێوانلێو بوو لەخەڵک، تەنانەت یەک کورسی خاڵی نەدەبینرا. پۆلیسەکان لەبەردەم دەرگاکە وەستابوون تا ڕێگربن لەهاتنەژوورەوەی ئەو کەسانەی خوازیاری بیستن و بینینی دادگاییکردنەکە بوون. ئەگەری هەیە لەمێژووی دادگاییکردنی تاوانەکان، قەرەباڵغی لەمشێوە بێ وێنە بێت و ئەوانەی

لەدەرەوەی هۆڵەکە بوون، جوێنیان بەخۆیان دەدا کەبۆ بەیانی کەمێک زووتر نەهاتوون تا جێگە بگرن بەڵام چارە نەبوو و دەبوا تا ئاشکرابوونی ئەنجامی دادگاییەکە لەدەرەوەی هۆڵەکە چاوەڕوان بن. لەم کاتەدا بەفەرمانی سەرۆکی دادگا دەرگای هۆڵەکان بەستران بۆ ئەوەی دادگاییکردنەکە دەستپێبکات.

ئێرە دادگایەکە کە بۆ دیاریکردنی چارەنووسی تاوانبارێک دەستپێدەکات و منیش وەک بینەرێک لەناو خەڵکان دانیشتووم.

لەسووچێکی دادگا دادوەرەکان بەجلوبەرگی ڕەسمی پاڵیان بەکورسی سەرۆکایەتییەوە داوە و هەمووان چاوەڕوانی فەرمانی سەرۆکی دادگان. ساتێک دواتر دەنگی وشکی چەکوشی سەرۆکی دادگا لەناو قەرەباڵغی ئامادەبووان دەنگیدایەوە و خەڵکی ناچار بەبێدەنگیکرد.

ئەمڕۆ چوونکە دووایین دانیشتنی دادگایی بەهمەن بوو، ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتنی دادگا بەشدارییان کردبوو تا بزانن چارەنووسی تاوانبارێک کە تا ئێستا لەهەموو دانیشتنەکانی دادگا بێدەنگ بووە جگە لەوتنی چەند وشە کەمن بکوژی ژنەکەمم، بەکوێ دەگات.

بۆ دووەمجار، چەکوشی سەرۆکی دادگا لەمێزەکە درا. هەناسە لەسینەکاندا توند بوو، بێدەنگییەکی قورس باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشا.

سەرۆکی دادگا بەدەنگی بەرز وتی:

زیندانی ژمارە ٤٤٩

پیاوێکی بالآبەرزی قژ ئالۆزکاو لەشوێنی تاوانباران هەستا و دووبارە دانیشتەوە.

دەنگەدەنگی سەیر لەناو خەڵکان بەرز بوویەوە.

ژنان و کچان دەیانوت: بەدبەختە، پێ ناچێت بکوژ بێت.

لەم کاتەدا سەرۆکی دادگا خەڵکانی ئاگادار کردەوە لەدەنگەدەنگ و نانەوەی قەرەباڵغی خۆیان بەدوور بگرن، دواتر بەدەنگی بەرز و ئارام ڕوویکردە تاوانبار و وتی:

بەپێی بەڵگەکانی ناو دۆسییەکەت و بەپێی شایەتی دراوسێکان و هەروەها دانپیانانی ڕاشکاوانەی خۆت، تاوانباری کەماوەیەک لەمەوبەر هاوسەرە دەوڵەمەندەکەت کوشتووە. ئایا دان بەگوناحەکەی خۆتدا دەنێیت.

هێشتا پیاوی زیندانی پەچەکرداری لەبەرابەر وتەکانی سەرۆکی دادگای نیشان نەدابوو کەداواکاری گشتی لەشوێنەکەی هەستا و وتی:

سەرۆکایەتی بەڕێزی دادگا، بەسەرەنجدان بەوەی ئەمڕۆ دووایین دانیشتنی دادگاییکردنی تاوانبارە، دەمەوێت ڕێگەم پێبدرێت چەند وتەیەک پێشکەش بکەم.

دواتر بەدەنگی ژنانە کە لەرزینی پێوە دیاربوو، وتی:

•

وەک خۆتان ئاگادارن، بەپێی یاسا کەسێک بەئەنقەست کەسێکی دیکە بکوژێت، دەکوژرێتەوە. نەزم و ئاسایشی کۆمەڵگا دەخوازێت یاسا سەبارەت بەقاتڵەکان بەتووندترین شێوە جێبەجێ بکرێت تا ببێتە وانە بۆ کەسانی دیکە و لەدووبارە کردنەوەی ئەم تاوانانە خۆیان بەدوور بگرن. بەسەرنجدان بەمە پێویستە ئاگادارتان بکەمەوە کەدادوەرە بەڕێزەکان دەبێت ڕەچاوی ئەمە بکەن: ئەو بکوژەی ئەمڕۆ لەپێشگای دادپەروەری ئامادە بووە، تاوانبارێکی دڵڕەقە کە بەوپەڕی بێڕەحمی و وەحشیگەری، ژنە گەنج و بێ گوناحەکەی کوشتووە. ئەو لەتەواوی دانیشتنەکانی دادگا بێدەنگی هەڵبژاردووە و سەبارەت بەهۆکاری کوشتنی ژنەکە هیچ ناڵێت.

هەمووان دەزانن بێدەنگی بێزارکەری تاوانبار لەدانیشتنەکانی دادگا، دادوەرەکانی بێزارکردووە و من دڵنیام ئەو دەیەوێت بەمشێوەیە بەدادوەرە بەڕێزەکان بڵێت من شێتم و بۆ ئەم شێتییە، بێدەنگی هەڵبژاردووە و بەسەرنجدان بەم خاڵە کە لەدۆسیە قەزاییەکانی دادگا زۆرجار بینراوە هەندێکات تاوانباران بۆ هەڵاتن لەسزا ئەو کارانە دەکەن و ئەم تاوانبارەیش ئەم ڕێگەی گرتۆتەبەر و دڵنیام ئەمجارەیش بێدەنگی خۆی ناشکێنێت، لەبەر ئەمە پێشنیار دەکەم دادوەرە

بەڕێزەکان بۆجێبەجێکردنی دادپەوەری و ڕێگرتن لەپشێوی لەکۆمەڵگا بڕیاری خۆیان بفەرموون و لەگەڵ ئەوەیشدا بیریان بێت بۆ تاوانبار سزای لەسێدارەدان بەپێی یاسای سزای گشتی، دیاریکراوە.

داوکاری گشتی بێدەنگ و لەشوێنەکەی دانیشت.

چاوی ئامادەبووان بەرەو تاوانبار سووڕا. بەهەمانشێوە کەخەمێکی بێ کۆتایی لەڕوخساری شەپۆلی دەدا، بزیەکی نەرم و گاڵتەئامێزانە لەسەر لێوەکانی نەخشی بەست. دواتر لەکاتێکدا چاوە خەمبارەکانی بڕیبووە دادوەرەکان، بەئارامی لەشوێنەکەی هەستا.

بێدەنگی باڵی بەسەر دادگادا کێشا بوو.

تاوانبار لەکاتێکدا بەدەنگی لەرزۆک چەند وشەیەکی نەشیاو بۆ تێگەیشتنی هێنایە سەر زمان، لێوەکانی تەڕ کرد و دواتر بەدەنگێکی ئارام و لەسەرخۆ دەستیپێکرد:

بەڕێز سەرۆک دادگا، دادوەرە بەڕێزەکان، گەنجێکی ئەم کۆمەڵگایەم، کۆمەڵگایەک کەئێوەی دادوەر و ئێوەی خەڵک بەشێکن لێی. نها بەتۆمەتی کوشتن لەپێشگای دادپەروەریدام و باڵە زێڕینەکانی فریشتەی دادپەروەری لەپێش چاوەکانم دەبینم کەمزگێنیم پێدەدەن دادپەروەری هەمیشە زیندووە.

دادپەروەری!

بەڵێ، دادپەروەری زیندووە و منیش لەو کەسانەی ئەم ئەرکە دژوارەیان لەئەستۆدایە داوا دەکەم گوێ لەوتەکانم بگرن و دواتر فەرمان و بڕیاری پێویست دەربکەن.

خوێندەواریم نییە، بەڵام بەو مانا نییە کەدەرسم نەخوێندبێت، نە وانییە، بەڵکو دەمەوێت بڵێم ئاستی خوێندەواریم ناگاتە ئاستی ئێوە کەدەتانەوێت حوکمێک دەربکەن. مافی خۆمە، چوونکە خوێندنی دواناوەندیم بەنیوەناچڵ بەجێهێشت بەڵام بەم ئاستەیش، بەناچاری خۆم بەرگریکردن لەخۆم دەگرمە ئەستۆ و لەکۆتا دانیشتنی دادگا قسەکانم دەکەم.

شەرمم لەخەڵک دەکرد لەوەی ڕاستییەکان بڵێم بەڵام ئێستا هەست دەکەم ئەمە هەڵە بوو چوونکە خەڵکیش بەشێکن لەم کۆمەڵگایە، کۆمەڵگایەک کەزۆر خێرا منی لەدواناوەندی ڕاونا و هاوپۆلییەکانمی گەیاندە شوێنە بەرزەکان. ئەمە مافی خۆیانە چوونکە ئەوان دەرسیان خوێند و من نەمخوێند و دەبێت سزاکەی وەربگرم.

من دوای خوێندنگا، وانەکانم لەناو ئەم کۆمەڵگایە کەئێوەی خەڵک پێکی دەهێنن، خوێند و ئەم کۆمەڵگایە بوو پشتی شکاندم و من لەناو تاریکییەکانیدا لەناوچووم. لەم کۆمەڵگایەدا بوو دەنگی خەڵکانی ستەملێکراو و بێ گوناحم بیست و لەگەڵ ئەوان بوومەیەک و بڕیارمدا ببمە هاوپۆلی ئەوان و دەرس بخوێنم.

بەڵام ئەم وانە، وانەیەک نەبوو پێویستی بەمامۆستا و خوێندنگا هەبێت چوونکە گەورەترین مامۆستاکەی کۆمەڵگا بوو.

من ئەو هاوپۆلییانەی لەکۆمەڵگا بەدەستم هێنابوو، هەموومان یەک بڕیارمان بوو، ئەوەیش بەدیهێنانی خەونەکانی گەنجیمانە. حەزمان دەکرد ئێمەیش وەک کەسانی دەستڕۆیشتوو و دەوڵەمەند چێژ لەژیان وەربگرین. دەمانویست ئێمەیش بەهەبوونی ترۆمبێل و پارە و ڤێلا لەڕیزی ئەو کەسانەدابین کە لەم شتانە کەڵکیان وەردەگرت.

بەڵام ئەفسووس ئێمە گوناحکار بووین و گوناحەکەمان نەبوونی واستە و پارە بوو، ئەگەری هەیە ئەگەر منیش ئەو دوو شتەم دەبوو ئەمڕۆ لەجێگەی تاوانبار دانەدەنیشتم و خەونە زێڕینەکەیشم بەمشێوەیە لەقوڕ نەدەچەقی.

دەستەیەک پێیان وایە لەژیاندا چارەنووس بوونی نییە و مرۆڤ هەرچی دەکات، خۆی دەیکات، بەڵام ئەمە ئەگەر تاڕادەیەک ڕاست بێت، لەسەداسەد ڕاست نییە. مێرووێک کەدوای بیست جار هەڵگەڕان و کەوتنەخوار لەدیوار، دەنکە گەنمێک دەگەیێنێتە هێلانەکەی، هەوڵێکی ماندوونەناسانەی بۆ سەرکەوتن ئەنجامداوە بەڵام ئەگەر ئەم مێرووە گرفتاری لافاوێکی خرۆشان بێت، دەتوانێت چی بکات.

منیش کەوتمە ئەو بارودۆخە و لافاوی خرۆشان لەگەڵ خۆی بردم بێ ئـەوەی تەنانەت هیوام بەژیان هەبێت، بەڵام زیندوو مامەوە. بەهەمانشێوە کەئەگەری هەیە مێروو بەڕێکەوت لەناو ئەو لافاوە بەتەختەیێکەوە بلکێت و لەمەرگ ڕزگاری بێت، منیش لەدەریای کۆمەڵگا لەمەرگ ڕزگارم بوو هەرچەند وەک خۆتان دەبینین ئەمڕۆ وەک بکوژێک دادگایی دەکرێم.

داواتان لێکراوە بڕیارێکی دڵنیاکەرەوە دەربکەن و مەحکومم بکەن.

بۆ، چوونکە بێدەنگ بووم، ئایا ئەگەر کەسێک نەیتوانی قسە بکات دەبێت بەخێرایی حوکمی سێدارەی بۆ دەربکەن؟

ئێوە پێم بڵێن ئەگەر کەسێک زمانی بەسترابێت و نەیتوانی لەبەر ئابڕووی بەرگری لەخۆی بکات، دەبێت بمرێت و دوو بەردی فەرامۆشی بکرێتە کێلی گۆڕەکەی.

ئێوە بەردەوام باسی دادپەروەری دەکەن بەڵام نازانن قسە کردن لەدادپەروەری بەجۆرێک لەجۆرەکان نادادپەروەرییە.

دادپەروەری!

ڕاستی چەند وشەیەکی قەشەنگ و جوانە بەڵام بەداخەوە لەهیچ کەسێکدا بەمانای ڕاستەقینەی وشە دەستناکەوێت و یاسا مرۆییەکان هەرگیز ناتوانن بەمانای ڕاستەقینەی خۆی جێبەجێی بکەن.

ئەی دادپــەروەری! لەبەرتۆ لەسنگی خۆیان دەکوتن و ئاژاوە دەنێنەوە بەڵام هیچکات ئامادە نین دان بەوەدا بنێن بەناوی دادپەروەری چ تاوان گەلێک و چ کار گەلێکی قێزەون ئەنجام دەدەن.

ئەمڕۆیش بەناوی دادپەروەری داواکرا حوکمێک سەبارەت بەمن دەربکرێت و بەدڵنیاییەوە بەدەرکردنی حوکمەکە، بەبۆچوونی ئێوە دادپەروەری جێبەجێ کراوە.

وتـرا جێبەجێکردنی حوکمی سێدارە، تـاوانـەکـان کەم دەکاتەوە بەڵام زۆرجار بینراوە بەیانییەک کەسێک لەسێدارە دراوە و شەوەکەی، کەسێکی دیکە کوژراوە.

ئەمڕۆ لەیاسای وڵاتە پێشکەوتووەکان حوکمی سێدارە هەڵوەشاوەتەوە و دادوەرەکانیش دەبێت ڕەچاوی ئەم خاڵە بکەن هەموو ئەو کەسانەی وەک قاتڵ لەدادگاکان دادگایی دەکرێن، وەک قاتڵ لەدایک نەبوون.

من ناڵێم حوکمی سێدارە جێبەجێ مەکەن، دەڵێم لێکۆڵینەوە لەمبارەوە بکەن و بزانن هۆکاری کوشتنەکە چییە؟ ئێوە کە بەپێی یاسای سزادانی گشتی، بۆ هەر بکوژێک داوای حوکمی سێدارە دەکـەن، ئایا بیرتان لـەوە کردۆتەوە ئەگەری هەیە ڕۆژێک بۆخۆتان بارودۆخێکی ئەوتۆ بێتەپێش بەشەقەزللەیەک کەسێک بکوژن، ئایا لەوشێوەدا ئێوەیش دەبێت لەسێدارە

بدرێن؟ ئەمانە دەڵێم بابەتی کوشتنەکان ڕوون ببێتەوە و لێکۆڵینەوەی پێویست ئەنجام بدرێت. یاسا بەبڕوای من دەبێت بۆ بکوژە ڕاستەقینەکان جێبەجێ بکرێت نەک بۆ هەرکەسێک بەبکوژ بناسرێت لەکاتێکدا گوناحکاریش نییە.

باشتر وایە لەم بابەتە تایبەتانە، چاوپیاخشاندنەوەیەک بەیاسادا بکرێت چوونکە من تەنیا تاوانبارێک نیم لەم دادگادا، دادگایی دەکرێم و بەدڵنیاییەوە دوای من و پێش منیش چەندین دادگایی دیکە ئەنجامدراوە و دەدرێت.

هەمووتان چاوەڕوانن خۆم هۆکاری کوشتنەکە ڕوونبکەمەوە، لەکاتێکدا ئەرکی ئێوەیە لەمبارەوە لێکۆڵینەوە بکەن بێ ئەوەی پێویستتان بەمن بێت.

ئێوە جێبەجێکردنی یاسا بەناوی دادپەروەری وەک سەرکەوتنێکی گەورە بۆخۆتان لەقەڵەم دەدەن بەڵام ئایا تا ئێستا بیرتان کردۆتەوە ئەگەر هەڵە بکەن، چی ڕوودەدات؟ بەدڵنیاییەوە هیچ!

چوونکە حوکمتان دەرکردووە و چیتر شیاوی گەڕاندنەوە نییە.

لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم وتانە لەبەر خۆم نییە بەڵکو لەبەر ئەو کەسانەیە لەداهاتوو لەم دادگایانە دادگایی دەکرێن. دەبێت لەبیری ئەواندا بین!

لەم کاتەدا داواکاری گشتی بەنیشانەی ناڕازیبوون لەشوێنەکەی هەستا و ڕوویکردە سەرۆکی دادگا و وتی:

بەڕێز سەرۆک، تاوانبار لەبابەتەکە لایداوە. باشترە لەجیاتی ئەو قسانە، بابەتە سەرەکییەکە ڕوونبکاتەوە.

تاوانبار بەساردی سەیرێکی داواکاری گشتیکرد و وتی:

نە، لەبابەتەکە لامنەداوە و بابەتەکە سەرەکییە پەیوەستە بەم شتانەی ئێستا باسمکرد. مەگەر بەکوشتنی تاوانبار نەکراوم و نابێت دووایین بەرگرییەکان لەخۆم بکەم، کەواتە دەبێت ئەو ئازادییەم پێ بدرێت زەینی دادوەرەکان بەو بابەتانەی لەهەر کوشتنێکدا دێنەپێش، ئامادە بکەم، لەبەر ئەوەی ئەو بابەتانەی بەلاوەکی ناوی دەبەن بەتەواوی پەیوەستە بەم دانیشتنەوە و لەبەر ئەوە ڕاشکاوانە دەڵێم لەبابەتە سەرەکییەکە لامنەداوە.

بەهەرحاڵ داوا لەدادوەرە بەڕێزەکان دەکەم سەرنج بدەن بەوتەکانم. لەڕاستیدا ئەوە بەسەرهاتی ژیانی منە و وەک دووایین بەرگری لەم دادگایە دەیگێڕمەوە و دەکرێت بۆ بینەران و دادوەرەکان بەسەرهاتی پیاوێک بێت کەئەمڕۆ ژیانی لەناوچووە و دەبێت تا کۆتایی تەمەنی لەگەڵ بیرەوەرییەکانی ژیان بەسەر ببات.

*****

تەمەنم ١٧ ساڵ بوو و لەپۆلی ١١ دواناوەندی دەمخوێند. بەداهاتوو گەشبین و دەمویست ڕۆژێک هەست بەبەختەوەری بکەم. حەزم دەکرد هەرچی زووتر دوو ساڵی کۆتایی خوێندنی دواناوەندی کۆتایی بێنم و بڕۆمە زانکۆ.

ژیان بەجوان و دڵخۆشکەر دەهاتە بەرچاوم و لەجوانییەکانی چێژم وەردەگرت و لەوەی هەستم دەکرد دوایِ کۆتایی هێنان بەخوێندن، سەرئەنجام دەبمە سەرچاوەی کارێک، شادوومان بووم. چەندین پلانی گەورەم لەمێشکمدا ئامادە کردبوو. لەو کاتانەدا زەنگی خوێندنگا، خۆشترین ئاهەنگم بوو بەتایبەت لەکاتی نیوەڕۆ چوونکە لەگەڵ زەنگی خوێندنگەکەی ئێمە، زەنگی خوێندنگەی کچانەی خوار خوێندنگەکەمان دەبیسترا.

کاتی نیوەڕۆ کاتێک کوڕان و کچان لەخوێندنگە دەهاتینەدەر، قەرەباڵغییەک لەسەر شەقام و شۆستەکان دروست دەبوو، لەسەیرکردنی کچان چێژم وەردەگرت بەڵام هەمیشە نەخوازراو دەمویست لەکچان خۆم بەدوور بگرم. لەگەڵ ئەوەی قۆز بووم و لەگەڵ ئەوەیشدا هاوڕێ کوڕەکانم دەیانوت لای کچان خۆشەویستم، هەرگیز هەوڵم نەدەدا ببمە هاوڕێیان. بیرمە چەند جارێک دەرفەتی ئەوەم دەست کەوت ببمە هاوڕێی کچان، بەڵام خۆم حەزم نەکرد.

کاتێک کوڕە هاوپۆلییەکانم باسی عەشقی کچانیان دەکرد، گاڵتەم پێدەکردن و دەموت لەم قۆناغەدا عەشق مانای نییە و ئەوان کەدەیانزانی بۆچوونم وەک ئەوان نییە، چیتر سەبارەت بەکچان قسەیان نەدەکرد بەڵام ئەم کوڕانە کاتێک بێ وەفاییان لەکچێک دەبینی و یا کچەکە لەگەڵ کوڕێکی قۆزتر و دەوڵەمەندتر تێکەڵ دەبوو، لەکاتێکدا ناڕەحەتی لەڕوخساریان دەباری، وتەکانیان پشتڕاست دەکردمەوە. ئەوەی ڕاستی بێت بەهیچ جۆرێک بڕوام بەڕەگەزی ژن و عەشقی ژن نەبوو، لەبەر ئەوە گاڵتەم بەوشەی عەشق دەهات.

سەرئەنجام گەمەکانی چارەنووس لەشوێنێکەوە دەستپێدەکات کەتەنانەت مرۆڤ خۆی ناتوانێت بیریشی لێبکاتەوە. ئەمە گەمەیە بۆمن لەڕۆژێکی ساردی پاییزییەوە دەستیپێکرد.....

ئەو دوانیوەڕۆیە بۆ سەیری کردنی یارییەکی دووگۆڵی ڕۆشتبوومە ئەمجەدییە، نزیکەی هەشتا خولەک سەیری یارییەکەم کرد بەڵام نازانم لەگەڵ ئەوەی زۆر حەزم لەیاری دووگۆڵی بوو، دە خولەکی کۆتایی نەمامەوە. لەناو سەیرکەرانەوە تێپەڕیم و ساتێک دواتر لەکاتێکدا دەنگی هاندانی سەیرکەرانم بەگوێ دەگەیشت، لەدەرگای ئەمجەدییە هاتمەدەر.

بەدەم پیاسەکردنەوە بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوتم. نوقمی دەریای ئەندێشە و بیرم لەداهاتوو دەکردەوە کەهەستم کرد کتێبەکانم لەدەستم کەوتەخوار. کاتێک سەرم بەرز کردەوە، کچێکم بینی سەرقاڵی کۆکردنەوەی کتێبەکانمە. بەخۆم وت ئەگەری هەیە ئەمە خەو بێت.

بەڵام دەنگی دڵنشینی ئەو، منی لەم خەوە هێنایەدەر و بەداوای لێبوردن وتی لەبەر ئەوەی لەوانەکەی دواکەتووە، ڕایدەکرد بۆ ئەوەی لەکاتی خۆیدا بگات و لەبەر ئەوەی ئاگای لەخۆی نەبووە، شانی بەرشانم کەتووە!

کچێک بوو زیاد لەڕادە جوان، قژێکی زەرد و درێژ، چاوی شین. نەمدەزانی چ حاڵێکم هەیە. قسەم نەدەکرد و حەپەساو سەیری چاوەکانیم دەکرد.

ئەو زۆر بەخێرایی کتێبەکانی کۆکردەوە، ماڵئاوایی کرد و هاوشێوەی برووسکە، چەند هەنگاو ئەولاتر ڕۆشتە ناو بینایەک کەشوێنی خوێندنی وانەکانی بوو. کچە لەبەرچاومدا نەمابوو.

جوانی و نیگای سەرنجڕاکێشی ئەو، کاریگەری لەسەر دانام بەشێوەیەک نەمدەتوانی هەنگاو هەڵبگرم و بۆ پێشەوە بڕۆم. وەک بڵێی ئەو چەند ساتەی تێپەڕی، زیاتر لەخەونێک نەبوو. ویستم شوێنی کەوم بەڵام درەنگ بوو.

بەهەنگاوی هێواش و لەرزۆک بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوتم. دەمەوئێواری گەیشتمە ماڵ، بێ ئەوەی وەک هەمیشە بڕۆمە ژوورەکەی دایکم و هەواڵی بپرسم، ڕۆشتمە ژوورەکەی خۆم و دوای داخستنی دەرگاکە، نوقمی دەریای ئەندێشە بووم.

ئەو شەوە دایکم هەرچەندەی وت، نانی ئێوارێم نەخوارد. دەمزانی چیم بەسەرهاتووە. پێداگرتنی دایکم بۆ ئەوەی قسە بکەم، بێ سوود بوو. سەرئەنجام بێ حاڵی کردە بیانوو و نەڕۆشتمە سەر مێزی نانخواردن. دایکم ژوورەکەی بەجێهێشت و جارێکی دیکە نوقمی دەریای ئەندێشە بوومەوە.

بەردەوام بیرم لەو کچە قژزەردە جوانە دەکردەوە و ئەو ڕووداوەم بیر دەهێنایەوە. سەرئەنجام لەبەر ئەوەی نەمتوانی دوای چەندین کاتژمێر، لەبیری بکەم، بڕیارمدا هەرچۆنێک بووە بیدۆزمەوە.

شەوێکی نائارام و سەیر بوو، کەسێک کەهەمیشە گاڵتەی بەعەشق دەکرد، ئێستا لەبەر کچێک، خەو لەچاوەکانی تۆرا بوو. ئەوشەوە بەدەم بیرکردنەوەی پەرێشان و ئاڵۆز، دوای چەندین کاتژمێر بێهۆ تێفکرین، ڕۆشتمە سەر قەرەوێڵەکەم و بەدەم بیرکردنەوە لەکچەکە، خەوم لێکەوت.

بەیانی کەمێک درەنگتر لەهەمیشە هەستام و دوای خواردنی نانی بەیانی، لەکاتێکدا بەدرۆ خۆم بەخۆشحاڵ نیشان

دەدا، لەبەر دوێنشەو، داوای لێبوردنم لەدایکم کرد، کتێبەکانم هەڵگرت و ڕێگەی خوێندنگام گرتەبەر.

بەڵام نەڕۆشتمە خوێندنگا و ڕۆشتمە ئەو شوێنەی دوێنێ کچەکەم بینی. بەخۆم وت لەوانەیە ماڵەکەی لەم نزیکانە بێت و بتوانم بیبینم. بەڵام هەڵەبووم و کچەکەم نەبینی.

دەمەو نیوەرۆ تەلەفۆنم بۆ ماڵەوە کرد و بەبیانوی خوێندنی زیادە بۆ نیوەڕۆ نەڕۆشتمەوە و بەدرێژایی نیوەڕۆی لەوێ مامەوە، بەڵام نەمبینی.

دەمەوئێواری، خەمبار ڕێگەی ماڵەوەم گرتەبەر. ئەو ڕۆژە بۆ یەکەمجار نەچوومە خوێندنگە و لەبەر ئەوە لەڕێگە بەردەوام بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر ماڵەوەمان لەلایەن خوێندنگەوە لەئامادەنەبوونم ئاگادار ببنەوە، ئابڕووم دەچێت.

ڕێگەچارەیەکەم دۆزییەوە. بڕیارمدا بڕە پارەیەک بەپۆستەچی بدەم بۆ ئەوەی نامەکە بەخۆم بدات. ئێوارێی ئەو ڕۆژە کاتێک پۆستەچی نامەکەی بۆ باوکم دەهێنا، پێنج تمەنم پێدا و داوام لێکرد نامەی ئامادەنەبوونم لەخوێندنگە بەخۆم بدات. ئەویش ڕازی بوو. لەمکارەی خۆم شادوومان بووم چوونکە ئەگەر بەو شێوەیە چەند ڕۆژێکیش نەدەڕۆشتمە خوێندنگە، کێشە نەبوو.

ڕۆژی دواتریش ڕۆشتمە ئەوێ و هەرچەند چاوەڕوان بووم، کچە دەرنەکەوت. دەمەوئێواریێ ڕۆشتمە ئەو بینایەی خوێندنی شەوانەی تیابوو بەڵام هەوڵەکانم بۆ دۆزینەوەی کچەکە لەبەر نەزانینی ژمارەی پۆلەکەی بێ ئەنجام بوو.

ڕۆژی سێیەم و چوارەم و پێنجەمیش تێپەڕی و نەمتوانی بیدۆزمەوە تا ئەوەی دوانیوەڕۆی ڕۆژی شەشەم، لەو کاتژمێرەی چەند ڕۆژ پێش بۆ یەکەمجار بینیبووم، لەهەمانشوێن بینیمەوە بەڵام پێش ئەوەی هیچ کارێک بکەم، ڕۆشتە ناو دووکانێک. چاوەڕێمکرد تا لەدووکانەکە هاتەدەر.

## ٢

بێ ئیرادە دەلەرزیم و نەمدەزانی بۆ، دڵم بەخێرایی لێی دەدا، ڕۆحم لەبەر خۆیەوە ئاهەنگێکی دەوت کەبۆم نامۆ بوو. ئەگەری هەیە ئەمە، عەشق بووبێت، گەنجی بووبێت یا هەست و سۆز. ئەوەندەی نەمابوو لەخۆشحاڵیدا شێت ببم. خۆم لەحاڵی خۆم سەرمسوڕمابوو.

بیرمدەکردەوە کاتێک لەدووکانەکە هاتەدەر، چی پێبڵێم و چۆن سەری قسەی لەگەڵ بکەمەوە. لەم کاتەدا لەدووکانەکە هاتەدەر، زمانم گیرابوو. ئەو بەرەو لام دەهات، ئێستا بەتەواوی نزیک بووبوویەوە. پاڵم بەدیواری ئەو شەقامە لاوەکییەوەدا کە لەسەر ڕێگەی کچەکە بوو.

ورەم بەدەست هێنا و وتم:

سڵاو!

لەکاتێکدا بزەیەکی شیرینی هێنایەر سەر لێو، وتی: سڵاو.

بەدەم ترس و لەرزەوە پرسیم:

تەنیان؟

بەڵێ.

دەتوانین کەمێک پێکەوە قسە بکەین؟

بزەیەکی گرت و هیچی نەوت.

بێدەنگی نیشانەی ڕەزامەندی بوو. لەبەر ئەوە منیش قسەم نەکرد.

پێکەوە بەڕێکەوتین. زمانی ئێمە تەنیا نیگاکردن بوو. دوای کەمێک لەسەر پێشنیاری ئەو ڕۆشتینە ناو کافەیەک.

چاوە شین و قژە زەردەکەی بەتەواوی شێتی کردبووم. ڕوخساری ئینجانەیەک گوڵ بوو. لێوەکانی کاڵ و ئاڵ.

نوقمی سەیرکردنی بووم، هاتە قسە و وتی:

بۆ قسە ناکەیت، مەگەر میوانت بانگێشت نەکردووە؟ بۆ ناپرسن حەزم لەچییە؟

وەک کەسێک تازە لەخەوێکی قورس هەستابێت، شڵەژام، داوای لێبوردنم کرد و دواتر بەشەرمەوە وتم:

ببوون، ڕاستی حەزتان لەچییە؟

هەرچی ئێوە بیخۆن.

ئێوە حەزتان لەچییە؟

بەزۆری قاوە دەخۆمەوە.

منیش هەروەها.

داوای دوو قاوەم کرد و چەند خولەک دواتر گارسۆن دوو قاوەی هێنا. بەدەم خواردنەوەی قاوە، قسەم دەستپێکرد و دوای کەمێک قسەکردن سەبارەت بەشتە لاوەکییەکان، سەبارەت بەخۆشەویست یا دەزگیران پرسیارم کرد. وتی نەخۆشەویستی هەیە و نەدەزگیران. ئەوسا بەخۆشحاڵییەوە پێشنیارم پێدا.

بێدەنگ بوو و هیچی نەوت. لەقسە کردن بەردەوام بووم و باسم کرد کەچەند ڕۆژە نەگەڕاومەتەوە بۆ خوێندنگە و لەبەر دۆزینەوەی ئەو بەردەوام لەو شوێنە چاوەڕوان بووم.

چاوەکانی حاڵەتێکی شەیتان ئاسای بەخۆیەوە گرت و بەبزە لەوەڵامدا وتی: بەهۆی نەخۆشییەوە چەند ڕۆژێک نەهاتۆتەوە بۆ خوێندن و وتی ئەویش لەم ماوەدا بیری لەبەریەککەوتنەکەی ئەو ڕۆژە کردۆتەوە.

بەم وشانە تیشکی هیوا لەدڵمدا درەوشایەوە و دەنگی لێدانی دڵم بەئاشکرا دەبیست. بۆ منێک کەتا ئێستا لەگەڵ کچێکدا ئاشنا نەبووم، ئەم ساتانە زیاد لەڕادە تایبەت و خۆشحاڵکەر بوو. بەڕادەیەک هەستم بەبەختەوەری دەکرد تا ئەو ڕۆژە و ئەو ئەندازەیە خۆم بەحۆشحاڵ نەبینیبوو.

چاوەکانی دەدرەوشایەوە، درەوشانەوەیەکی تایبەت، درەوشانەوەیەک پیاوی دەکوشت، ئەگەری هەیە پێش کوشتن

دەیسووتاند و دەیکردە خۆڵەمێش. بۆ من لەهەمووان سەرتر و جوانتر بوو. جوانی سەرنجڕاکێش، جادوویی و سەرسامکەر بوو.

ماوەی کاتژمێرێک بەسەر گفتوگۆی ئێمە لەکافێکە تێپەڕی و لەناکاو هەستم کرد ڕوخساری گۆڕا. چاوەکانی حاڵەتی ئاساییان لەدەستدا و هاوشێوەی کەسێک گرفتاری ئازاری دڵ بووبێت، لەخۆی دەئاڵا. دەمارەکانی ڕوخساری ئاوسان و شینبوویەوە.

بەتەواوی ناڕەحەت بووم و پرسیم:

حاڵتان باش نییە.

بەزۆر بزەیەکی گرت و وتی: نە، نە، باشم.

تەنیا کەمێک دڵم ئازاری هەیە، دواتر هەستا، داوای لێبوردنی کرد و بەرەو دەسشۆرەکە ڕۆشت و کاتێک گەڕایەوە، کەمێک باشتر بووبوو.

لەکاتێکدا لەو گۆڕانە سەرمسوڕمابوو، بەگومانی ئەوەی ئەگەری هەیە هەوای ناو کافێکە وای لێکردبێت، پێشنیارم کرد بڕۆینەدەر و پیاسە بکەین.

ڕەزامەندی نیشاندا و دوای پێدانی حسێبەکەمان، لەکافێکە هاتینەدەر.

بەچەند شەقامێک گوزەرمانکرد. چەند خولەک دواتر لەیەکێک لەشەقامە لاوەکییەکانی نزیک کۆشک بووین. شەقام چۆڵ و هەستمان بەدەنگدانەوەی پێی خۆمان دەکرد.

ئەو ڕۆژە یەکێک لەباشترین ڕۆژەکانی ژیانم بوو چوونکە هەستم دەکرد بەبەدەستهێنانی ئەو، بەختەوەری ڕاستەقینەم بەدەست هێناوە.

بۆ کەسێک بەردەوام گاڵتەی بەعەشق دەکرد، ئەم دیمەنە وەک خەونێک بوو نەشیاو بۆ باوەڕپێکردن بەڵام پێشهاتبوو.

لەو ساتانەی دەستە سووتێنەرەکانی من دەستی نەرم و ناسکی ئەوی دەگوشی، تەنیا بزەیەکی دەگرت.

لەکاتێکدا چاوم بڕیبووە بزەی شیرینی، پێم وت خۆشمدەوێیت، زۆر زۆر خۆشم دەوێت. تەنانەت لەم ڕێگەدا ئامادەم گیانم پێشکەش بکەم. ئەویش خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕیم. ئەم بیرەوەرییەی ئەوم بۆ هەمیشە لەدڵما هێشتەوە و هیچکات لەبیری ناکەم.

هەستێکی بێ وێنە لەناخمدا شەپۆلی دەدا، لەوەی کچی خوازراوی خۆمم دۆزیبوویەوە، هەستم بەبەختەوەری دەکرد. ئێستا وەک بت دەمپەرەست.

پێکەوە ماوەیەکی زۆر لەشەقامەکاندا پیاسەمان کرد. کاتێک شەو دەیویست عابای ڕەشی خۆی بەسەر پەردەی

شینی ئاسمان بڵاو بکاتەوە، بەرەزامەندی لێکجیابووینەوە.

بەرادەیەک لەم ئاشنایی و تێکەڵبوونە سەرسام بووم، بیرمچوو ناوی بپرسم بەجۆرێک لەکاتی ماڵئاوایی خۆی ئەم بابەتەی بیرخستمەوە و وتی: ناوم رۆئیایە و لەساڵی یەکەمی پەیمانگای یاسا، سەرقاڵی خوێندنم. منیش خۆم ناساند و وتم ناوم بەهمەنە و لەدواناوەندیم.

دواتر دەستی یەکمان گرت و نیگاکانمان بەریەک کەوت و دوای ساتێک بێدەنگی، بەپێچەوانەی ویستی خۆمان جیابووینەوە و لەگەڵ ئەوەی بەڵێنم پێدا بەیانی دەڕۆم و دەیبینم، رێگای ماڵەوەم گرتەبەر، بەڵام بیرەوەری ئەو رۆژە بۆ هەمیشە لەدڵما مایەوە.

# ٣

بەیانی ئەو ڕۆژە نەچوومە خوێندنگە و بۆ بینینی رۆئیا بەرەو زانکۆ بەڕێکەوتم. لەڕێگە بیرم لەبەریەککەوتنەکەی ئەو ڕۆژە دەکردەوە، هەستم بەوە کرد بەپێی ئەوەی یەکەم ساڵی زانکۆیەتی، دەبێت تەمەنی لەمن زیاتر بێت بەڵام گرنگیم بەو شتانە نەدەدا.

هەستم دەکرد ڕوئیام خۆش دەوێت و بۆم گرنگ نەبوو ئەو لەمن بچووکتر یا گەورەتر بێت. لەکاتێکدا بیرم لەو دەکردەوە، نیو کاتژمێر دواتر گەیشتمە بەردەم دەرگای زانکۆ. لەبەر ئەوەی زانکۆ داخرابوو و خوێندکاران بەمەبەستی نانی نیوەڕۆ دەرۆیشتن، بەباشم زانی لەبەردەم دەرگای چوونەژوورەوەی زانکۆ کەلەنزیک پەیمانگاکەی رۆئیا بوو، چاوەڕێی بکەم.

لەساتەکانی چاوەڕوانیدا بوو دیمەنێکی چاوەڕواننەکراوم بینی.

لەم کاتەدا ترۆمبێلێک لەجۆری (کارمێن)ی سوور لەشەقامی پەیمانگاوە بەرەو دەرگای چوونەدەرەوەی زانکۆ دەڕۆشت،

لەکاتێ وەستانی لەبەر دەرگای زانکۆ، سەرنجی منی بەلای خۆیدا ڕاکێشا.

دوو کەس لەناو ترۆمبێلەکەدا بوون، گەنجێکی نەناسراو کەچاویلکەی ڕەشی لەچاوا بوو و کەسێکی دیکە کەبەباشی دەمناسی و ئەویش کەس جگە لەخۆشەویستەکەم، ڕوئیا نەبوو.

کاتێک دڵنیابووم هەڵە ناکەم، لەوەی ڕۆئیام لەناو ترۆمبێلی پیاوێکی بێگانەدا بینی، بەرچاوم لێڵ بوو. بۆ چەند ساتێک کۆنترۆڵی خۆم لەدەستدا و تەنانەت نەمدەتوانی شوێنیان کەوم، بەڵام ژمارەی ترۆمبێلەکەم نووسی و دواتر بڕیارمدا هەرچۆنێک بووە، ڕاستییەکان بخەمەڕوو.

دوای ئەوەی خوێندکاران لەزانکۆ هاتنەدەر و حەوشی زانکۆ چۆڵ بوو، ڕۆشتمە سەر شەقامی ئەو پەیمانگایەی ڕۆئیا لەوێ دەیخوێند و ڕاستەوخۆ ڕۆشتمە لای هۆڵی وانەخوێندنەکان و دوای پرسیارکردن لەچەند خوێندکارێک، هۆڵەکەی ڕۆئیام دۆزییەوە. کاتێک لەدەرگا نزیکبوومەوە، سەبارەت بەڕۆئیا لەفەڕاشێکی پیر کەسەرقاڵی پاککردنەوەی ژوورەکان بوو، پرسیارم کرد.

فەڕاشی پیر کە لەزۆربڵەیی و پێداگری من بێزار بووبوو، وەڵامی بێ سەرەوبەری دەدامەوە و کاتێک چەند تمەنێکم پێدا،

بزەیەکی گرت و وتی:

ببوورن باش لەپرسیارەکانتان حاڵی نەبووم، هەرچیتان دەوێت بپرسن بەڕێزا تا ئەو شوێنەی بتوانم هاوکاریتان دەکەم.

نیشانی ڕوئیام پێدا و دەرکەوت ڕوئیا باش دەناسێت.

دواتر خۆم وەک خوازبێنیکەری ئەو ناساند و وتم چوونکە دەمەوێت پێش هاوسەرگیری بەوردی سەبارەت بەڕوئیا لێکۆڵینەوە بکەم، دەخوازم هەرچی دەزانێت پێم بڵێت.

لەبەر ئەوەی ناڕەحەت و نیگەران بووم، سەرەتا ویستم خاوەنی ترۆمبێلەکە بناسم و بۆ ئەوەی پێش هەر شتێک بابەتەکەم بۆ ڕوون ببێتەوە، بەفەڕاشە پیرەکەم وت: ڕاستی ئێستا ڕوئیام لەناو ترۆمبێلێکی سووردا بینی.

ئەو ترۆمبێلە سوورە هی کێیە؟

ساتێک بێدەنگ بوو، دواتر وتی: خاوەنەکەی ناوی ئەحمەدە و هاوپۆلی ڕوئیایە و باوکی کەسێکی دەوڵەمەند و خۆیشی کەسێکی دەستڕۆیشتووە.

لەکاتێکدا لەبەر خۆمەوە چەند جوێنێکم بە ئەحمەددا، پرسیارەکانم سەبارەت بەڕوئیا دەستپێکرد. بزەیەکی گاڵتەئامێزی کرد و وتی:

وەک کوڕەکان دەڵێن، ئەو دووانە هاوڕێن و زۆربەی

کاتەکانی ڕۆژ پێکەوە بەسەر دەبەن.

دەڵێن ئەحمەد هێرۆئین دەکێشێت و ڕوئیایشی ئالوودە کردووە و ڕوئیایش بۆ ئەوەی هێرۆئین لەئەحمەد وەربگرێت، ناچارە لەهاوڕێیەتی کردنی بەردەوام بێت.

ئەحمەد ساڵی پار بەهۆی گەڕان لەگەڵ کەسانی خراپ لەدەرەوەی زانکۆ، ئالوودەی هێرۆئین بوو و لەبەر ئەوەی باوکی پارەی پێویستی بۆ دابینکردنی هێرۆئین پێنەدەدا، ناچار بوو، لەباندێکی بازرگانیکردن بەمادە هۆشبەرەکان چالاکی بکات بەڵام بەرپرسانی زانکۆ پێیانزانی و دەریانکرد.

بەڵام باوکی ئەحمەد بۆ پاراستنی ئابڕووی ڕێگەی لەئەحمەد گرت و ئەوی لەنەخۆشخانە خەواند بۆ ئەوەی واز لەبەکارهێنانی مادده بێهۆشکەرەکان بێنێت و دواتر بەدانی بەڵێننامە، ئەحمەد جارێکی دیکە گەڕایەوە بۆ زانکۆ.

بەڵام کەم تازۆر دووبارە دەبیسترێت کەئەحمەد دووبارە ئالوودە بۆتەوە و ئەویش بۆتە هۆی گیرۆدەبوونی رۆئیا.

بەبیستنی قسەکانی ئەو فەڕاشە کەوتمە لەرزین، ئەژنۆکانم شل بوو و ئەوەندی نەمابوو بکەوم. بەخێرایی ماڵئاواییم لەفەڕاشەکە کرد و بەرەتەڵ بردن لەزانکۆ هاتمەدەر.

نەسیمێکی فێنک هەڵیکردبوو، گەڵاکان گۆرانییان دەخوێند. وەک کەسێکی مەست بووم کەهەر سات ئەگەری بوو بکەوم.

لەماڵەوە تەلەفۆنم بۆ ڕوئیا کرد. لەماڵەوە بوو، بێ ئەوەی باسی ڕۆشتنم بۆ زانکۆ بکەم، بڕیارمدا کاتژمێری چواری ئێوارێی ڕۆژی دواتر لەکافتریایەک لەشەقامی شارەزا ببینم.

تەلەفۆنەکەم داخستەوە و نوقمی دەریای ئەندێشە بووم. بیرکردنەوە لەئالوودە بوونی ڕوئیا ئازاری دەدام. هەرچۆنێک بوو تا کاتژمێری چواری بەیانی چاوەڕێم کرد و لەو کاتژمێرەدا بەتەکسی ڕۆشتمە شوێنی ئاماژەپێدراو.

ڕوئیا چەند خولەکێک درەنگتر هات، لەشوێنەکەم هەستام و لەگەڵ ئەوەی هەوڵم دەدا بەزۆر پێبکەنم، داوام لێکرد دانیشێت.

وتم:

دواکەوتیت.

داوای لێبوردن دەکەم کارم بوو، چەند خولەکێک دواکەوتم.

باشە چی دەخۆیت؟

بەستەنی.

زۆرباشە.

داوای بەستەنیم کرد. ڕوئیا دەستی بەقسە کرد، لەحاڵی منی پرسی و بۆ ئەوەی هەست بەناڕەحەتیم نەکات، زۆر ئاسایی وەڵامی پرسیارەکانیم دایەوە.

گارسۆن بەستەنییەکانی هێنا و دەستمان بەخواردن کرد.

بەزۆر بەستەنییەکەم دەخوارد.

کاتێک تەواو بوو، پێشنیارم کرد بڕۆینەدەر و پیاسە و لەگەڵ ئەوەیشدا گفتوگۆ بکەین. ڕازی بوو.

لەکافتریاکە هاتینەدەر و ڕۆشتینە شەقامی ڕامسەر. خۆر دووایین پاشماوەی خوێناوی خۆی لەپشت چیاکانەوە شاردەوە و ئێوارێ و جوانییە دڵگیرەکەی دەستی پێکرد.

بەدەم پیاسەکردنەوە لەشەقامی ڕامسەرەوە بەرەو شەقامی سورەییا ڕۆشتین. جەنگێکی سەیر لەناخمدا هەڵگیرسابوو، هەستم دەکرد بەزەییم بەڕوئیادا دێتەوە، بەڵام ئەمە بەزەیی نەبوو، بەڵکو خۆشم دەویست و ئەمەیش منی ناچار بەڕزگارکردنی ڕوئیا کرد.

سەرئەنجام بڕیارمدا ئەم بابەتە لەگەڵ ڕوئیادا باس بکەم بۆ ئەوەی بەهاوکاری خۆی ڕێگەچارەیەک بۆ ڕزگاربوونی بدۆزینەوە. کاتێک بابەتەکەم درکاند، حەپەسا. فرمێسک لەچاوەکانی کۆبوونەوە و قوڵپی گریان، قوڕگی گرت و لەوەی زانی هەموو ڕاستییەکان دەزانم، نارەحەت بوو.

دڵنیام کردەوە تەنیا لەبەر خۆشەویستی باسی ئەم بابەتەم کردووە و دەمەوێت هاوکاری بکەم. بەڵێنم پێدا تا دوایین سات بۆ ڕزگارکردنی هەوڵ بدەم. لەگەڵ ئەوەیشدا داوام لێکرد لەمەودوا سواری ترۆمبێلەکەی ئەحمەد نەبێت و لەبەر وەرگرتنی هێرۆئین، هاوڕێیەتی نەکات. بەڵێنی پێدام ئەو کارە

بکات. ئەم بەڵێنە بۆ من بەڵگە بوو.

دوای ئەو ڕۆژە ڕوئیا بەشێوەیەکی هەستپێکراو گۆڕا و دوای ئەو لێکۆڵینەوانەی کردم، دەرکەوت پەیوەندی بەتەواوی لەگەڵ ئەحمەد پچڕاندووە و گرنگی بەهەڕەشەکانی ئەحمەد نەداوە.

لەبەر ئەوەی ڕوئیا ئالوودەی هێرۆئین بووبوو، نەیدەتوانی بەخێرایی وازی لێبێنێت، بەو برەپارەی لەباوکی وەردەگرت وئـەوەی من پێم دەدا، هێرۆئینی دەکـڕی و دەیکێشا بەڵام هەوڵی دەدا هەموو ڕۆژێک کەمتر لـەڕۆژی پێشتر بکێشێت تا بتوانێت بەتەواوی دەستبەرداری بێت. لەو بارودۆخە ڕازی و دڵنیابووم ڕوئیا بەو ڕێگەی گرتوویەتییە بەر، دەتوانێت بەزووترین کات دەستبەرداری هێرۆئین ببێت و دوای ئەوە دەمانتوانی ژیانی هاوبەش دەستپێبکەین.

لەم بگرە وبێنەدا دەستە و تاقمەکەی ئەحمەدیش بێکار دانەنیشتن. ئـەوان بۆ تۆڵـەسـەندنـەوە لـەڕوئـیـا، باوکیان لەئالوودەبوونی کچەکەی ئـاگـادار کـردەوە. باوکی ڕوئیا کەپیاوێکی دەوڵەمەند و سووخۆر بوو، تا ئەو ڕۆژە گرنگی بەژیانی کچەکەی نەدابوو.

ئەو پیاوێکی سووخۆر و زیاتر لەهەموو شتێک گرنگی بـەکـارەکـەی دەدا. زیـاد لــەڕادە لـەخـۆڕازی بـوو، کاتێک

لەبەدبەختی کچەکەی ئاگادار بوویەوە، وەک هەزاران باوکیتر، بێ گرنگیدان بەهیچ شتێک، تەنیا کارێک کەکردی ئەوە بوو چیتر پارەی بەڕوئیا نەدا.

ئەم پیاوە لەجیاتی ئەوەی بیر لەڕزگارکردنی ڕوئیا بکاتەوە، بەگومانی خۆی بەبڕینی پارە، ڕوئیا ناچار دەکات دەست لەهێرۆئین هەڵبگرێت.

ڕوئیا کاتێک ئەمەی بۆ باسکردم، بەڵێنم پێدا هەرجۆرێک بووە ناهێڵم بێ پارە بێت و بەو پارەی من بەڕوئیام دەدا، چیتر پێویستی بەپارەی باوکی نەبوو. باوکە نەزانەکەی پێی وابوو بەمشێوەیە کچەکەی ڕزگار دەکات.

ئێستا من و ڕوئیا زۆربەی ڕۆژەکان لەو کاتانەی بێ ئیش بووین، چاومان بەیەک دەکەوت و کاتەکانمان پێکەوە بەسەر دەبرد. ڕۆژ و مانگەکان بەسەرچوون و وەرزی تاقیکردنەوەکان نزیکبوویەوە. لەسەر پێشنیاری ڕوئیا بەهەوڵدانێکی بێوچان دەستم بەخوێندن کرد و ویستم هەرجۆرێک بووە، قەرەبووی دواکەوتنم بکەمەوە. ڕوئیایش لەوانەکاندا هاوکاری دەکردم و سەرئەنجام توانیم بەسەرکەوتوویی تاقیکردنەوەکان تەواو بکەم و بەنمرەی زۆر باش دەرچووم.

ڕوئیا کاتێک لەدەرچوونم ئاگاداربوویەوە، زیاد لەڕادە شادوومان بوو. ئەوەندە لەیەک نزیکبووبووینەوە، خەم و

شادییەکانمان پەیوەست و پەیوەندیدار بوو. من و ئەو ڕۆحێک بووین لەدوو جەستەدا.

چەند حەفتە دواتر تاقیکردنەوەکانی ڕوئیایش کۆتایی هات و بەنمرەی زۆرباش دەرچوو. هەم من لەدەرچوونی ئەو شادوومان بووم، هەم ئەو لەدەرچوونی من.

کاتێک پشووی هاوینە دەستیپێکرد، باوکی ڕوئیا کەگومانی دەکرد بەنەدانی پارە توانیویەتی ببێتە هۆی ئەوەی کچەکەی دەست لەهێرۆئین هەڵبگرێت، بەخەیاڵی خۆی و بۆ هاوکاریکردنی ڕوئیا بڕیاریدا ئەو بۆ باخەکەیان لە (مەیگون) لای دایەگەورێی ڕەوانە بکات.

ڕوئیا کاتێک ئاگاداری کردمەوە، شادوومان بووم چوونکە منیش دەمتوانی بۆ پشووی هاوین برۆمە باخی مام لەمەیگون و لەوێ دەمتوانی کاتێکی زیاتر لەگەڵ ڕوئیا بەسەر ببەم.

سەرئەنجام ئەمە ڕوویدا و من و ئەو هەرکام لەماوەی چەند ڕۆژدا ڕۆشتینە مەیگون.

لەبەیانی ئەو ڕۆژەوە، من و ڕوئیا چەندین ڕۆژی خۆشمان لەگەڵ یەکدا دەستپێکرد، هەموو بەیانییەک دەڕۆشتینە چیا، بەباخەکاندا دەسووڕاینەوە، لەگەڵ کوڕان و کچانی دیکە گەمەمان دەکرد و بەکورتی کاتەکانمان بەخۆشی بەسەر دەبرد و بەمشێوەیە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خۆشەویستیمان زیاتر دەبوو.

ڕۆژە گەرم و درێژەکانی هاوین تێپەڕین و ژیان بۆ دۆخی ئاسایی گەڕایەوە.

ڕۆژێک ئاگاداریان کردمەوە باوکم داوای کردووە بەپەلە بگەڕێمەوە بۆ تاران. لەبەر ئەوە بەخێرایی ماڵئاواییم لەڕوئیا کرد. لەکاتێکدا فرمێسک لەچاوەکانی دەبـاری، بەڵێنم پێدا هەرجۆرێک بووە بگەڕێمەوە. ڕۆشتم.

کاتێک لەمەیگونەوە گەیشتمە تـاران، ڕێگەی ماڵەوەم گرتەبەر. بارودۆخ نائاسایی بوو، هەموو شتێک لەگەڵ ڕابردوو جیاواز بوو. ژمارەیەکی زۆری خزم و کەسوکار لەماڵەکەمان دەبینران، هەمووان خەمبار و چاو بەگریان بوون. لێرەدابوو، ڕاستییەکی تاڵم بۆ دەرکەوت و تێگەیشتم دایکم بۆ هەمیشە ماڵئاوایی لەژیانکردووە.

بەبیستنی هـەواڵی مەرگی دایکم فرمێسک لەچاوەکانم داباری و لەهۆش چووم بەشێوەیەک چەند کەس لەکەسوکار، هاوکاریان کرد و بەئاگایان هێنامەوە. نەمدەزانی چارەنووسم دوای مەرگی دایکم بەکوێ دەگات.

مەرگی دایکم بارودۆخی ئاڵوگۆڕ و چارەنووسی گۆڕیم. دوای مـەرگی ئـەو چیتر نەڕۆشتمە خوێندنگە و شەش مانگ دواتر باوکم ژنێکی دیکەی هێنا و ژیان لەو ماڵە بوو بەجەهەننەم.

ئەگەر باوکم لەکاتی ژیانی دایکم، ژنی دەهێنا ئەوەندە نارەحەت نەدەبوم بەڵام چوونکە بەماوەیەکی کەم دوای مەرگی دایکم ژنی هێنا، بەتەواوی لێی بێزار بووبووم.

تەنیا هیوای من لەدنیا ڕوئیا بوو. بڕیاریمدا ئێستا کەچارەنووس بەمەرگی دایکم، ڕێڕەوی ژیانی گۆڕیم، لەگەڵ ڕوئیا پەیوەندی هاوسەرگیری ببەستم و دوای دەستبەرداربوونی لەمادە سڕکەرەکان، ژیانێکی ئارام و خۆش دەستپێبکەین.

بەم خەیاڵەوە، هەرچەندە حەز بەچارەی باوکم نەدەکرد، داوام لێکرد کارێکم بۆ بدۆزێتەوە. چەند حەفتە دواتر باوکم کاری بۆ دۆزیمەوە و لەسەر ڕاسپاردەی ئەو لەشەریکەیەکی بیناسازی لەبەشی ژمێریاری دەستبەکار بووم.

لەکارەکەم ڕازی بووم و هەوڵم دەدا سەرۆکەکانی شەریکەش لێم ڕازی بن، بەمشێوەیە بەوپەڕی دەستپاکی و نییەتپاکی لەماوەیەکی کەمدا توانیم پێشکەوم و ببمە سەرۆکی خەزێنەی شەریکە. بارودۆخم باشتر و داهاتەکەم بەشی پێکهێنانی خێزانی دەکرد.

لەو مانگانەی وەرمدەگرت، هەم بەشی ڕوئیام دەدا و هەم بەشی خۆم هەڵدەگرت.

تەنیا کێشەم ئالوودەبوونی ڕوئیا بوو و من بۆ ئەوەی پەیوەندی هاوسەرگیری لەگەڵ ببەستم، دەبوا ئەو دەستبەرداری هێرۆئین ببێت. بۆ ئەم مەبەستە ڕۆژێک کەپیاسەمان دەکرد، لەڕێگە پێشنیاریم کرد لەنەخۆشخانەیەکی تایبەت بیخەوێنین بۆ ئەوەی پزیشکەکان پشکنینی بۆ بکەن و بزانین بۆ ڕزگارکردنی چەندەی پارەی دەوێت.

ڕوئیا ڕازی بوو و پێکەوە سەردانی نەخۆشخانەیەکی تایبەتمانکرد. پزیشکی بەڕێوەبەری نەخۆشخانە دوای پشکینی ڕوئیا وتی دەهــەزار تمەن وەردەگرێت بۆ ئەوەی چارەسەری بکات. هەوڵەکانم بۆ کەمکردنەوەی ئەو برە پارە بێسوود بوو. پزیشک وتی چوونکە ماوەیەکی زۆر بەسەر ئالوودەبوونی ڕوئیا دەگوزەرێت، دەبێت خوێنەکەی بگۆڕێت. قسەکردن بێسوود و ماڵئاواییمان کرد و هاتینەدەر. لەڕێگە دوای بەراورد کردنی هاکەزایی بینیمان دوو ساڵی پێدەچێت تا بتوانم ئەو پارەیە پاشەکەوت بکەم و ئەم دوو ساڵە ئەگەری هەیە دەیان ڕووداو بێتەپێش و ببێتە هۆی جیابوونەوەی من و ڕوئیا. لەبەر ئەوە بڕیارمدا هەرچۆنێک بووە ئەو برە پارەیە بۆ ڕزگارکردنی ڕوئیا لەزووترین کاتدا دابین بکەم.

## 4

لەبەیانی ئەو ڕۆژەوە هەوڵەکانم بۆ دابینکردنی پارەی نەخۆشخانەکە دەستپێکرد. سەردانی هەموو شوێنێکم کرد و دەستی هاوکاریم بۆ هەموو هاوڕێ نزیکەکانم درێژ کرد بەڵام هیوابڕاو بووم. بیرم لەوە کردەوە بڕۆمە لای خوشکە گەورەکەم لەشیراز. خوشکم لەشیراز ژنێکی ناودار و دەوڵەمەند بوو. دەیتوانی هاوکاریم بکات. مێردی خوشکەکەم سێ ساڵ پێش بەهۆی کارەساتی ترۆمبێلەوە گیانی لەدەستدا و چوونکە مناڵیان نەبوو و هەروەها مێردەکەی هیچ میراتهەڵگرێکی نەبوو، تەواوی سامانەکەی بەخوشکەکەم گەیشت. خوشکەکەم دوای مەرگی مێردەکەی شووی نەکردوە و بەتەنیا لەشیراز ژیانی بەسەر دەبرد و لەداهاتی ئەو موڵکانە و ئەو پارە زۆرەی لەمێردەکەی بۆی مابوویەوە، ژیانی دەگوزەراند. دەیتوانی پارەم پێبدات.

ئەمە باشترین ڕێگە بوو. بەتەلەفۆن ڕوئیام لەمەبەستەکەم ئاگادار کردەوە و دواتر بەمەبەستیماڵی خوشکم ڕێگەی

شیرازم گرتەبەر. دەمەوبەیانی گەشتمە شیراز. لەپاسەکە دابەزیم. هەوا سارد و بارانی بوو، هەورە ڕەشەکان بەئاسماندا بڵاو بووبوونەوە. بەدڵێکی خەمبار و ناڕەحەت بەرەو ماڵی خوشکم بەڕێکەوتم لەکاتێکدا ڕوئیام دەبینی بەجلوبەرگی سپی و نوقمی خشڵ و مرواری دەستەکانی بەرەو لام درێژ کردووە، بزە دەگرێت و منیش بەڵێنی پێدەدەم لەم بەدبەختییە ڕزگاری بکەم. نازانم چەندە لەو حاڵەدابووم کەهەستم کرد ماوەی نێوان گاراج و ماڵی خوشکم تەواو بووە.

کاتژمێر پێنج بـوو، لـەبـەردەم مـاڵی خوشکمدا بـووم. بەهێواشی دەستە ساردەکانم لەگیرفان دەرهێنا و زەنگم لێدا. مـاوەی سێ خولەک زەنگم لێدا تا ئـەوەی خزمەتکاری خوشکەکەم لەخەو هەستا و دەرگای بۆ کردمەوە.

منی ناسییەوە. سڵاوی کرد و لەکاتێکدا بەبینینی من لەو کاتەدا حەپەسا بوو، ڕێگەی ژوورەوەی نیشاندام.

بێ ئـەوەی گرنگی بەسەرسوڕمانی خزمەتکارەکە بدەم، بـەرەو ژووری خوشکم ڕۆشتم. ئەو کە بەدەنگی زەنگەکە ئاگای بووبوویەوە، بەبینینم شادوومان و لەئامێزی گرتم. دوای چاکوچۆنی و هـەواڵ پرسـی، لـەبـەر ئـەوەی هیلاک بـووم، بەباشمزانی ئێستا سـەبارەت بەداواکارییەکەم هیچ نەڵێم. جێگەیان بۆ ڕاخستم بۆ ئـەوەی بحەوێمەوە. نازانم

چەند کاتژمێر خەوتم بەڵام کاتێک لەخەو هەستام، نزیکەی دوانزەی نیوەڕۆ بوو. هەستام و دوای دەموچاو شۆردن، نانم خوارد و دواتر لەگەڵ خوشکم لەمیوانخانەکە دانیشتین. دوای پێشەکییەکی کورت سەبارەت بەهیلاکی ڕێگا، بابەتەکەم بۆ باسکرد و پێم وت چۆن ڕوئیام ناسیوە و بارودۆخی چۆنە و داوای ئەو بڕە پارەم لێکرد.

خوشکەکەم سەرەتا بزەیەکی گرت و شادوومان بووم لەوەی پارەم پێ دەدات بەڵام لەناکاو ڕوخساری مۆن و وتی:

ڕاستی چەندەت پارە پێویستە.

دەهەزار تمەن!

وتی:

تۆ برامیت و حەز دەکەم هاوکاریت بکەم بەڵام ئەوەی تۆ داوای دەکەی لەئێستادا نیمە، ئەگەر دەتەوێت، سێ هەزارت پێ دەدەم و پاشماوەکەی تا شەش مانگی دیکە بۆت دەنێرم. جیاواز لەوە ناتوانم لەئێستادا ئەو بڕە پارە بدەم.

قسەکانی خوشکم خەریک بوو شێتم بکات. بەم وەڵامەی کۆشکی هیوا و ئاواتەکانی ڕووخاندم، بەدڵێکی پڕ لەهیوا و ئارەزوو ڕۆشتمەلای بەڵام بێهیوای کردم.

لەو کاتەدا بوو ڕژدیم بەدەوڵەمەندەکان برد. حەزم دەکرد دەوڵەمەند بم و بتوانم بەپارە بەهەموو خەون و ئاواتەکانم بگەم بەڵام بەداخەوە نەمبوو.

لەدڵدا بەخودام وت بۆ دەستەیەک ئەوەندە پارەیان هەیە نازانن چۆن هەڵیبگرن و دەستەیەک ئەوەندە نیازمەندن کەنانی شەویان نییە و برسی دەڕۆنە سەر جێگە بەڵام وەڵامم بۆ ئەم پرسیارەم دەستنەکەوت. هیوابڕا و نوقمی بیرکردنەوەی پڕوپوچ، هاتمەدەر و دوای ماڵئاوایی کردنی سارد و سڕ لەگەڵ خوشکەکەم و خزمەتکارەکەی، گرنگیم بەخولقی ئەو بۆ مانەوە لەشیراز نەدا و هاتمەدەر. ماوەیەک بێکار بەناو شەقامەکانی شیرازدا پیاسەم کرد وسەرئەنجام بێهیوا، لەکاتێکدا نەمدەزانی چیم بەسەر دێت، سواری پاسێکی شەق و شڕ بووم و بەرەو تاران گەڕامەوە.

درەنگانێک گەیشتمە تاران و کاتی کارکردن لەشەریکە بەسەر چووبوو. لەبەر ئەوە بەتەلەفۆن سەرۆکی شەریکەم ئاگادار کردەوە بەهۆی نەخۆشییەوە نەمتوانیوە ئامادە بم و دوای نیوەڕۆ بەکاری زیادە قەرەبووی ئامادەنەبوونم دەکەمەوە. دوای ئەم تەلەفۆنە، لەتاران سەردانی هەموو ئەو شوێنانەم کرد کەهیوام پێیان بوو بەڵام بەداخەوە هیچ ئەنجامێکم دەست نەکەوت.

بێهیوایی وەک خۆرە تەواوی جەستەمی کون کون کرد، هەستمکرد ڕۆحم لەجەستەم دەفڕێت و جەستەی شەکەتم بەدەستی فەرامۆشی دەسپێرێت بەڵام نە، هەرگیز ئەوە ڕووی

نەدا. نەمردم و خۆڕاگریم کرد و لەهەوڵەکانم بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن بەردەوام بووم. زیندوو مامەوە تا سروشت گەمەکانی لەگەڵم درێژە پێبدات و چارەنووس، هەر بەڵایەک دەخوازێت بەسەرم بێنێت.

دوانیوەڕۆ بەناڕەحەتی ڕۆشتمە شەریکە و لەژووری کارەکەم، نیگەران و پەرێشان لەپشت مێزەکە دانیشتم و سەرقاڵی کارکردن بووم. لەبەر ئەوەی کارەکانم بەهۆی سەفەرەکەم بۆ شیراز دواکەوتبوو، دوای داخرانی شەریکە و ڕۆشتنی فەرمانبەرەکان، بۆ ئەنجامدانی کارە دواکەوتووەکانم لەشەریکەدا مامەوە.

کاتێک هەمووان ڕۆشتن و جگە لەفەڕاشەکە کەس نەمایەوە، سەرقاڵی کارە دواکەوتووەکانم بووم و دوای تەواوکردنی کارەکەم، ویستم بڕۆمەدەر کەهێزێکی نامۆ منی بۆ لای سنووقەکە برد.

پارەکانی ناو سنووقەکە چاویان لێدادەگرتم. لەخەیاڵدا ڕوئیام دەبینی کەڕزگارکردنی پەیوەستە بەم پارانە و لێم دەپاڕێتەوە و دەڵێت ڕزگارم بکە. هەرکارێکم دەکرد ئەم دەنگە نامۆ و ئاڵۆزە لەناخمدا کپ بکەم، نەمتوانی. پارەکان لەبەرابەرم بوو بەڵام توانای هەڵگرتنیانم نەبوو.

بیرمکردەوە ئەگەر پارەکان هەڵبگرم، ڕیسواییەکی

گەورە بەرۆکم دەگرێت جیاواز بەوە بۆ کەسێکی وەک من کەبڕواپێکراوی سەرۆکی شەریکە بووم، کارێکی نەشیاو بوو.

بەڵام سەرئەنجام لەدۆخێکی دەروونی و بێ ئەوەی توانای بیرکردنەوەم هەبێت، بڕە پارەی پێویستم لەسنووقەکە هەڵگرت و لەشەریکە ڕۆشتمەدەر.

بیرمکردەوە لەبەر ئەوەی خۆم بەرپرسی ژمێریاریم بۆ ماوەی حەفتەیەک دەتوانم ئەم بابەتە بشارمەوە و ڕێگە نەدەم کەس بەکەمبوونەوەی پارەکە بزانێت لەگەڵ ئەوەیشدا هیوادار بووم بتوانم لەماوەی ئەم حەفتەدا پارەکە دابین و بیگەڕێنمەوە بۆ شوێنەکەی. ئەم گومانە فیرۆیە بووە هۆی ئەوە پارە لەسنووقی شەریکە بدزم.

بەیانی ڕۆژی دواتر بەترس و لەرزەوە پارەکەم هەڵگرت و ڕۆشتمە ماڵی هاورێی نزیکم حەمید.

حەمید یەکێک لەهاوڕێ نزیکەکانم بوو. باوکی چەندین باخ و ملکی لەدەوروبەری تاران بوو و حەمید کاروبارەکانی باوکی بەڕێوە دەبرد. زۆرجار هاوکاری دەکردم و تەنانەت بۆ دابینکردنی ئەو بڕە پارەی پێویستم بوو، داوای لەباوکی کرد بەڵام نەیتوانی لێی وەربگرێت.

من و حەمید زۆر نزیک بووین و لەمناڵییەوە هەموو ڕاز و نهێنییەکانمان بۆ یەک باس دەکرد. حەمید بەڕواڵەت کوڕێکی

باش بوو بەلام بەتەواوی گوێڕایەڵی باوک و بێ قسەیی نەدەکرد چوونکە جیاواز لەوە باوکی پارەی پێنەدەدا. لەگەڵ ئەمەیشدا ئەو بەڕواڵەت هاوڕێیەکی نزیک و باشی من بوو.

ئەو ڕۆژە بەرەبەیان زەنگی ماڵی حەمیدم لێدا، نۆکەرەکەیان دەرگاکەی بۆ کردمەوە، سلاوی کرد و دوای ئەوەی وەلامم دایەوە، بەرەو ژوورەکەی حەمید ڕۆشتم..

تازە لەخەو هەستابوو، بەبینینی من حەپەسا. وتم ڕووداوێکی گرنگ ڕوویداوە و بێ پێشەکی هەموو شتێکم بۆ باسکرد. حەمید دوای بیستن پێداگری دەکرد لەوەی بەخێرایی پارەکە بۆ سنووقی شەریکە بگەڕێنمەوە. هەروەها بەڵێنی پێدام لەماوەیەکی کەمدا ئەو پارەیە دابین بکات. دڵنیامکردەوە تا دابینکردنی پارەکە دەتوانم ڕێگە نەدەم کەس بەم دزییە بزانێت و دواتر دەیگەڕێنمەوە. حەمید پێداگری دەکرد لەوەی پارەکە بگەڕێنمەوە و دەترسا لەوەی شتەکە ئاشکرا ببێت و من وەک دز تەسلیم بەیاسا بکەن.

دڵنیامکردەوە شتی وا ڕوونادات. ئەگەر ئەویش نەتوانێت پارەکە دابین بکات، کاتێک باوکم ئاگادار دەبێتەوە، پارەی شەریکە دەدات چوونکە خاوەنی شەریکەکە هاوڕێی نزیکی باوکمە.

حەمید وتی: تۆ شێتی، تۆ لەبەر کچێکی هێرۆئینی بێ بەها، پێگە و ئابڕووی خۆت دەخەیتە مەترسییەوە، باشترە ئەو کارە نەکەیت.

قیژاندم بەسەریا و نەمهێشت قسەکەی تەواو بکات. وتم ئەو کارەم کردووە و پەشیمان نابمەوە. حەمید کاتێک سووربوونی منی بینی، دەستی لەدژایەتی کردن هەڵگرت و هیچی نەوت.

٥

ڕۆژی دواتر بەنیگەرانی و ترسەوە ڕۆشتمە سەرکارەکەم و بەهەرجۆرێک بوو، بێ ئەوەی کەس بزانێت، سەرقاڵی کاربووم. دوای تەواوبوونی کار، یەکسەر ڕۆشتمە لای ڕوئیا. لەهەمیشە جوانتر و سەرنجڕاکێشتر بوو. کاتێک نیگامان بەریەک کەوت، هەستمکرد دڵم دەلەرزێت، لەبەرابەر هێزی عەشقی ئەو بێ هێز دەبووم. بەخۆم دەوت لەبەرابەر ئەو هەموو پاکی و خۆشەویستییەی ناخی ڕوئیا، ژیانیش گرنگ نییە. بەخۆشحاڵییەوە دەستم خستە ناو قژی، دواتر سەبارەت بەدابینکردنی پارەکە، درۆیەکم پێکەوەنا و وتم بەهۆی یەکێک لەهاوڕێکانمەوە پارەکەم دابینکردووە. لەکاتێکدا بەگومانەوە سەیری دەکردم، دەیویست بزانێت پارەکەم چۆن و لەکوێ بەدەست هێناوە بەڵام لەوەڵامی پرسیارەکانی گاڵتەم دەکرد و کاتێک پێداگرتنی بێسوود بینی، تەسلیم بوو. بڕیارماندا ئێوارێی ئەو ڕۆژە لەگەڵ حەمید بچینە ئەو نەخۆشخانە تایبەتە و ڕوئیا لەوێ بخەوێنین.

ڕوئیا کەشادومان و خۆشحاڵ بوو، سوپاسی کردم. لەوەی شادوومانی و خۆشحاڵی ڕوئیام دەبینی، کەمترین گرنگیم بەکارەکەم نــەدەدا. شادوومانی ئـەو بۆ من هەموو شتێک بوو. من و ئەو دەمانتوانی دوای ڕزگاربوونی ژیانێکی خۆش دەستپێبکەین. دوای ئەم قسانە لەبەر ئەوەی نزیک نیوەڕۆ بوو، پێشنیارمکرد نانی نیوەڕۆ لەڕیستۆرانتێک بخۆین. ڕازی بوو و پێکەوە ڕۆشتینە ڕیستۆرانتێک و نانمان خوارد. دواتر ڕۆشتینە سینەما و دوای ئەوە ڕوئیام بردەوە بۆ ماڵ. بڕیاربوو دوای نیوەڕۆ ڕوئیا بەماڵەوە بڵێت لەگەڵ هاوپۆلییەکانی بۆ گەڕان بەشارەکانی ئێران بۆ ماوەیەکی زۆر دەڕواتە سەفەر و دواتر لەبەردەم نەخۆشخانەکە چاوەڕێ بکات تا پێکەوە بڕۆینە نەخۆشخانە.

کاتژمێر شەش بەخێرایی جلەکانم پۆشی و تەلەفۆنم بۆ حەمید کرد تا بێتە ئەو شوێنەی بڕیاربوو چاومان بەڕوئیا بکەوێت. دواتر لەماڵ هاتمەدەر.

کاتێک گەیشتمە شوێنی دیاریکراو، ڕوئیا پێش من گەیشتبوو بەڵام هێشتا حەمید دیار نەبوو. لەم کاتەدا دەنگی وشکی ستۆپی تاکسییەکی شەق و شڕ بەرزبوویەوە و حەمید دابەزی.

دوای ناساندنی ڕوئیا و حەمید بەیەک، هەرسێک بەرەو نەخۆشخانەکە بەڕێکەوتین. نزیکەی شەش و نیو لەنەخۆشخانەکە بووین. لێپرسراوی زانیاری ئێمەی بەرەو هۆڵی چاوەڕوانی ڕێنوێنی کرد و بەتەلەفۆن دوکتۆری ئاگادار کردەوە. چەند خولەک دواتر دوکتۆر هات و ئێمەی بردە ژوورەکەی.

دوای گفتوگۆیەکی زۆر بڕیاردرا ڕوئیا بخەوێنن. پارەی خەواندنی ڕوئیامدا و بڕێک پارەم بەخۆیشیدا تا بۆ پێویستییەکانی خەرجی بکات. داوام لەدوکتۆرەکە کرد بەجوانی ئاگایان لەڕوئیا بێت و ئەویش بەڵێنیدا هەموو هەوڵەکانی بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ڕوئیا دەخاتەگەڕ و کارێک دەکات بەئاسانی دەستبەرداری ئەو بەدبەختییە بێت.

لەم کاتەدا دوکتۆر ئەو ژوورەی نیشاندایین کەدەبوا ڕوئیا تیایدا بخەوێت. بەجێی هێشتین. حەمیدیش بەبیانووێک لەژوورەکە ڕۆشتەدەر و من و ڕوئیاماینەوە.

کاتێک بەتەنیا ماینەوە، ڕوئیا دەستی بەگریان کرد و خۆی خستە باوەشم. دواتر لێوم کەوتە سەر لێوی و یەکترمان لەئامێزگرت. جەستەی گەرم و سووتێنەر و چاوەکانی فرمێسکیان دەباراند. شێوەیەکی سەیر بەڕوخسارییەوە نیشتبوو. بۆ چەند ساتێک بێ ئیرادە منیش هەستمکرد دەمەوێت بگریم.

چەند ساتێک بەمشێوەیە تێپەڕی و کاتێک گەڕاینەوە دۆخی ئاسایی، ساتیماڵئاوایی کردن بوو.

حەمید هاتەژوور و بۆ ئەوەی زیاتر لەوە نارەحەت نەبم، ڕوئیا داوای کرد زووتر نەخۆشخانە بەجێبێڵین. هەرچەند لەدڵەوە نەمدەویست لەم بارودۆخەدا ڕوئیا بەتەنیا جێبێڵم بەڵام بەهۆی پێداگرتنی خۆی، لەگەڵ حەمید ماڵئاواییمام لێکرد و لەژوورەکە هاتینەدەر. ڕوئیا تا نزیک دەرگاکە هات و پاڵی بەدیوارەکەوەدا و سەیری ڕۆشتنی ئێمەی دەکرد. کاتێک لەکۆتایی ڕێڕەوەکە لەبەرچاوی ون دەبووین، قسەکانی لەناو ڕێڕەوەکەدا دەنگیدایەوە: بەهمەن، زووزوو وەرە بۆلام، زووزووو!

گریان قسەکانی پێبڕی. ڕۆشتەژوور. دەنگی بەسترانی دەرگای ژوورەکەیم بیست. نازانم چ حاڵێکم بوو بەڵام فرمێسک لەچاوم دەباری.

چیتر توانای ڕۆشتنم نەمابوو، بەهاوکاری حەمید، لەدەرگای چوونەدەرەوە هاتینەدەر.

کاتێک لەحەوشی نەخۆشخانە هاتینەدەر، شەو داهات و ئەستێرەکان لەئاسماندا چاویان دادەگرت. حەمید کەزانی تەواو نیگەران و پەرێشانم، دڵنەوایی دەکردم. ئەو شەوە بۆ من تاریکتر لەهەموو شەوەکانی خواوەند بوو. لەوەی ڕوئیا

لەنەخۆشخانە خەوێنرابوو، ڕازی بووم بەڵام بەهۆی ئەو دزییەی کردبووم، خۆم بەداماو و بەدبەخت دەهاتەبەرچاو. لەدۆخێکی قەیراناویدا بووم و نەمدەزانی سەرئەنجامم بەکوێ دەگات. لەبەر ئەوەی باوکم منی بەشەریکە ناساندبوو، نەمدەزانی ئەگەر ئەو دزییە ئاشکرا ببێت، چی ڕوودەدات. بۆ پیاوێک کەژیانی شەرەفمەندانە بەسەر بردبوو، دزی کارێکی شیاو و گونجاو نەبوو. دەمزانی بۆ ڕزگارکردنی گیانی مرۆڤێک دزیم کردووە بەڵام لەڕووانگەی کۆمەڵگە، ئەمە پاساوێکی شیاوی ڕازیبوون نییە، دزی، دزییە چ لەبەر ڕزگارکردنی گیانی کەسێک بێت یا بۆ دابینکردنی ژیان!

ئەم بیرکردنەوەیە ئازاری دەدام بەڵام چارە نەبوو دەبوا خۆم بەچارەنووس بسپێرم. ئەوەی بۆ من ڕوویدابوو، چیرۆکێک بوو کەس کۆتاییەکەی نەدەزانی.

نوقمی ئەم بیرکردنەوە و ئەندێشە پەرێشانانە هاوڕێ لەگەڵ حەمید ماوەیەک بێ مەبەست بەشەقامەکاندا سووڕاینەوە. دڵنەوایی حەمید نەیتوانی ئارامم بکاتەوە.ماڵئاواییم لێکرد و ڕێگەی ماڵەوەم گرتەبەر.

ڕاستەوخۆ ڕۆشتمە ژوورەکەم. لەتاو شەکەتی و ماندوویی ڕۆشتمە سەر جێگەکەم و نوقمی دەریای ئەندێشە بووم. بایەکی سارد لەناو لقی دارەکانەوە دەیلووراند و سەری

دەکێشا بەشووشەی پەنجێرەکە.

خەمبار و نیگەران بیرمدەکردەوە. سەرئەنجام لەبیرکردنەوەیش بێزار بووم و بەدەم بیرکردنەوەی تێکەڵ و پێکەڵ خەوم لێکەوت.

ڕۆژی دواتر، زووتر لەڕۆژانی پێشوو لەخەو هەستام و بەترس و لەرزەوە ڕوومکردە شەریکە. کاتێک گەیشتم جگە لەخزمەتکار و فەڕاشەکە کەسی دیکەی لێنەبوو. ڕۆشتمە ژووری کارەکەم. ترسێکی بێ وێنە سەرتاپای جەستەمی داگرتبوو. بیرم دەکردەوە هەرسات ئەگەری هەیە سەرۆکی شەریکە بەڕووداوەکە بزانێت و ڕاپێچی زیندانم بکات.

لەگومانی ئەوەی بەدەستی بەستراو ڕادەستی یاسام بکەن، دەلەرزیم بەڵام چارە چی بوو. خۆم بەچارەنووس سپاردبوو و چارەنووس بەدڵی خۆی دەکرد. وەک شەپۆلێک بووم کەدەگەیشتمە کەنار و لەناودەچووم.

دەبوا چاوەڕێی بڕیاری چارەنووس بم. بەڕێکەوت ئەو ئێوارێیە چارەنووس قوماری بەژیانی منەوە کرد و سەرکەوت!

دەمەوئێوارێ، خاوەن شەریکە بۆ بەستنی گرێبەستێکی گرنگ داوای پارەی سنووقەکەی لێکردم. گێژ و وێژ بووم و نەمدەزانی دەبێت چی بکەم. تەلەفۆنم بۆ ماڵی حەمید کرد، لەماڵ نەبوو. کەسێکم بەدوای باوکمدا نارد بەڵام نەیتوانی باوکم

بدۆزێتەوە. سەرئەنجام بەهۆی شڵەژانی خۆم، بەڕێوبەری شەریکە لەدزییەکە ئاگادار بوویەوە.

لەبەر ئـەوەی هـاوڕێی باوکم بـوو، هەمانشەو باوکمی بانگکرد و لەڕووداوەکە ئاگاداری کردەوە. باوکم ڕاشکاوانە پێی وت:

لەبەر ئەوەی خۆم کوڕەکەم بەئێوە ناساندووە، ڕادەستی پۆلیسی بکەن بۆ ئەوەی تەمێ بکرێت. ئەو دزە و کەسێک دەستی بۆ دزی درێژ کرد دەبێت سزا بدرێت تەنانەت ئەگەر کوڕی من بێت.

بەو وەڵامە ڕاشکاوانەی باوکم، سەرۆکی شەریکە بەناچاری منی تەسلیمی پۆلیس کرد. لەکاتێکدا وەڵامـی پۆلیسەکانم سەبارەت بەهۆکاری دزینەکە نەدایەوە، لەگەڵ ئەو دۆسیەی بۆم تەواو کرابوو، تەسلیمی بنکەی پۆلیس کرام.

سێ مانگ دواتـر لەیەکێک لـەدادگاکان، دادگـایـی کـرام. ئـەوان سـووربـوون لـەسـەر ئـەوەی هـۆکـاری دزییەکەیان بۆ ڕوونبکەمەوە بەڵام ڕاستییەکانم نەوت بۆ ئەوەی کەس لەبەسەرهاتی من و ڕوئیا ئـاگـادار نەبێتەوە. لەبەر ئەوە لەوەڵامی پرسیاری دادوەرەکـان بێدەنگیم هەڵبژارد. کاتێک ئەوان بێدەنگی منیان بینی و زانییان بەهیچ جۆرێک ئامادە نیم ڕاستییەکان بڵێم، دوای کۆتایی هاتنی دادگا بەتۆمەتی دزینی

دەهەزار تمەن، ساڵێک زیندانییان بۆ بڕیمەوە.

گرنگ نەبوو کەمنیان وەک دز دادگایی کرد و مەحکوم کرام. ئەوە گرنگ نەبوو وەک دزێک منیان بردە زیندان بۆ ئەوەی ساڵێ لەوێ بمێنمەوە، گرنگ ڕزگارکردنی ڕوئیا بوو. من بۆ ڕزگارکردنی ئەو لەم بەدبەختییە، ئامادە بووم بەم ڕیسواییە ڕازی ببم و ساڵێک لەزیندان بمێنمەوە.

بەهەرحاڵ بێدەنگی لەوبارەوە، بیرۆکەی خۆم بوو. لەو ساتانەدا بیرم لەخۆم نەدەکردەوە، بەڵکو بیرم لەڕزگارکردنی ڕوئیا لەبەلای هێرۆئین دەکردەوە لەبەر ئەوە بەڕەزامەندی بەو حوکمە ڕازی بووم.

لەزینداندا بوو ڕاستییەکی تاڵی ژیانم بۆ دەرکەوت و هەستم بەتام و چێژی ئازادی کرد. تەنها لەنێوان زیندان و ئازادی دیوارێکی بڵند جێگر بوو. لەو لای دیوارەکە مرۆڤە بەختەوەر و ئازادەکان بەهیوای داهاتوو، هەوڵی زیاتریان دەدا و لەملای دیوارەکە، زیندانییەکان ڕۆژیان دەکردە شەو و شەویان دەکردە ڕۆژ بۆ ئەوەی کۆتایی بەقۆناغی دیلبوونیان بێنن.

مرۆڤ لەزیندان لەڕۆحی هەندێک لەزیندانییەکان سەریسوڕ دەمێنێت، بۆ نمونە ئەو کەسانەی بەزیندانی هەتاهەتایی و سێدارە مەحکوم کراون بەڵام هەرگیز هیوایان لەدەست نەداوە.

ئـەوان کـەهـەرکـام بـەسـەرهـاتێکی سـەیروسـەمـەریـان هەیە، هەرگیز نەیانویستووە تەمەنی شیرینیان لەناو ئەم چـواردیـوارییـەدا بـوگـزەرێـت و زۆربـەیشـیـان نـازانـن بۆ چارەنووسیان بەم شوێنە کۆتایی هات بەڵام بڕوایان وایە مرۆڤ دەبێت لەهەر دۆخێکدا بێت، هیوابڕاو نەبێت.

ئـەم زیندانییانە کاتێک لـەمـاوەی حوکمەکەم ئـاگـادار دەبوونەوە، دەوریان دەگرتم و دەیانوت خۆزگەمان بەخۆت چوونکە تەنیا ڕۆژێکی دیکە لێرەیت و سەرئەنجام ئـازاد دەبـیـت. لەقسەکانیان سەرمسوڕدەما بـەڵام کاتێک بۆیان ڕوونکردمەوە، بینیم ئەوان ڕاست دەکەن و بۆ ئەو کەسەی بەزیندانی هەتاهەتایی حوکمدراوە، ساڵێک وەک ڕۆژێک وایە چوونکە بەهەرشێوەیەک بێت ئەم ساڵە دەڕوات و سەرئەنجام زیندانی ئازاد دەبێت.

بەڵام ئەو کەسەی بەزیندانی هەتاهەتایی حوکمدراوە، چیتر بیر لەساڵێک و چەند ساڵ ناکاتەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا هیواداره ڕۆژێک بەر لێبوردن بکەوێت و لەسێدارە ڕزگاری بێت.

بەپێی غـەریزەی سروشتی، هـەر مرۆڤێک گیانی خۆی خۆشدەوێت و ئامادەیە لەچواردیواری زیندان بۆ هەمیشە هەموو ڕۆژێک بمرێت و زیندوو ببێتەوە بەڵام ئامادە نییە

سێدارەی بکەن.

ئەم دەستەیە لەگەڵ ئەوەی دەزانن مرۆڤ بیەوێت و نەیەوێت دەبێت بمرێت، هەموو هەوڵێکی خۆیان دەخەنەگەڕ بۆ ئەوەی بەئاسانی تەسلیمی مەرگ نەبن. بەبۆچوونی ئەم دەستەیە دەبێت شەڕی ئەوان وانەیەک بێت بۆ ئەوانەی بەبچووکترین کێشە، خۆیان بەلەناوچوو دەبینن.

کاتێک باسی ڕوئیام بۆ دەکردن، کاتێک هەست و خۆشەویستی خۆم بۆ ڕووندەکردنەوە، دەیانوت: هیواداربە، بجەنگە، ئێمەیش دەزگیران، باوک، دایک، هاوسەرمان هەیە بەڵام لەزینداندا هیوای خۆمان لەدەست نەداوە.

قسەکانیان هێزی ژیانیان پێدەبەخشیم. کاتێک بیرمدەکردەوە بەزیندانی بوونی من کەسێکی دیکە ڕزگاری دەبێت، خۆم بەبەختەوەر دەزانی. ڕوئیا بۆ من هەموو شتێک بوو، زیندان لەبەر ئەو گرنگ نەبوو.

ژیان لەزیندان جگە لەسنوورداربوونەکەی، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ دەرەوە نەبوو. لەم شوێنە کەوەک شارێک بەدیواری بڵند دێتەبەرچاو، مرۆڤەکان وەک ئەوانەی لەودیو دیوارەکە ژیانیان بەسەر دەبرد و هەوڵیان دەدا، هەوڵیان دەدا. منیش لەناو ئەم مرۆڤانەدا بووم و وەک ئەوان بەهیوای داهاتوویەکی ڕوون زیندوو مامەوە.

لەزیندان جگە لەحەمید کەس لەخزم و کەسوکار و هاوڕێکانم سەردانیان نەدەکردم. تەنیا ئەو بوو دەهات و لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو پردی پەیوەندی نێوان من و ڕوئیا بوو. حەمیدم ڕاسپاردبوو هەرچۆنێک بووە نەهێڵێت ڕوئیا لەزیندانیبوونەکەم ئاگادار ببێتەوە. ئەویش بەڵێنیدا هەموو کارێک بکات بۆ ئەوەی ڕوئیا ئاگادار نەبێتەوە.

لەگەڵ ئەوەی لەزیندان بەردەوام هیوایان پێدەبەخشیم، بەڵام بێ ڕوئیا خۆم وەک مردوو دەبینی. ڕۆژەکان بیرمدەکردەوە و شەوان لەنارەحەتیدا خەوم لێنەدەکەوت. دەترسام لەوەی ڕوئیا لەبیرم بکات.

بەڵام چوونکە بڕوام بەئەمەکداری ڕوئیا بوو، ئەم بیرۆکەم لەمێشکمدا دەسڕییەوە. لەلایەکی دیکە تا ئەندازەیەک ئاسوودە بووم چوونکە حەمیدم ڕاسپاردبوو بەڕوئیا بڵێت بەناچاری ڕۆشتوومەتە سەفەرێکی دووروودرێــژ و چـاوەڕێ بێت تا دەگەڕێمەوە. بەڵام نازانم بۆ هەرکات لەزیندان بیرم لەڕوئیا دەکردەوە، دڵم دەلەرزی.

چەندینجار ئــارەزووم کـرد خـۆزگـە ئـەو کاتـەی ڕوئیا لەنەخۆشخانە دەهـاتـەدەر، منیش ئـازاد دەبـووم بۆ ئەوەی پێشوازی لێبکەم و یەکتر لەئامێز بگرین و ماچبارانی بکەم و بۆ ڕزگاربوونی لەو بەڵایە، پیرۆزبایی لێبکەم. دەمویست

دوای ڕزگاربوونی ژیانێکی تازە دەستپێبکەین و بەختەوەر بین بەڵام بەداخەوە هەرگیز ئەو ئاواتەم نەدی چوونکە ئەو کاتەی ڕوئیا لەنەخۆشخانە هاتەدەر، پێنج مانگی حوکمەکەم مابوو. بەسەرەنجدان بەوەی سێ مانگ پێش حوکمەکە و دوو مانگ دوای ئەوەیش لەزینداندا بووم، دەبوا حەوت مانگی دیکە لەزیندان بمێنەوە.

ئەم بابەتە ئازاری دەدام و لەگەڵ ئەوەی دڵنیابووم حەمید لەنەبوونی من بەباشی ئاگای لەڕوئیا دەبێت تا ئەوکاتەی لەزیندان دێمەدەر، بەڵام نیگەرانی داهاتووی خۆم و ڕوئیا بووم.

هەستێکی نامۆ و ئاڵۆز شەو و ڕۆژ لەزیندان ئازاری دەدام. کاتێک ئێوارێ دادەهات و ڕۆژ دەمرد، لەسووچێکدا دادەنیشتم و بیرمدەکردەوە. لەوانەیە باوەڕ نەکەن بەڵام بەدڵنیاییەوە دەڵێم، خەمبارترین ئاوابوونی خۆر، ئاوابوونی خۆرە لەزیندان. هەموو شتێک لەزیندان لەکاتی ئاوابووندا ڕەنگپەڕاو و مردوو بەرچاو دەکەوێت. تەنانەت دەنگەکانیش لەو کاتەی ڕۆژ کۆتایی دێت، خەمبارترن.

ئاوابوونی زیندان بەم تایبەتمەندییانە، ئاگری تێبەردەدام و خەمباری دەکردم. لەگەڵ ئەوەی دەڵێن خەمبزوێنەرترین ئاوابوونەکان، ئاوابوونی ژیانە، من بڕوام وایە لەئاوابوونی

زیندان خەمبارتر بوونی نییە. بەئاوابوونی ژیان مرۆڤ بۆ هەمیشە دەڕواتە جیهانی خامۆشییەوە بەڵام لەزیندان ئەم ئاوابوونە، هەموو ڕۆژێک دووبارە دەبێتەوە.

لەڕاستیدا سەرەتای ئاوابوون لەزیندان، سەرەتای خەم و فرمێسکە تاڵەکانی من بوو.

گریان لەئاوابوونی خۆی لەسووچێکی تاریکی زیندان، ئاسوودەی بەدڵم دەبەخشی. هەوڵم دەدا لەگەڵ دۆخی زیندان خۆم بگونجێنم. خوازراو و نەخوازراو بەهەمانشێوە کەمرۆڤ عادەت بەشتێک دەگرێت، منیش بەزیندان عادەتم گرت. هەرکات دڵم دەگیرا و بیری ڕوئیا دەکەوتمەوە، دەڕۆشتمە سووچێک و دەگریام و لەوەی سەرئەنجام ڕۆژێک ئازاد دەبم، تیشکی هیوا لەدڵمدا دەدرەوشایەوە و مزگێنەی ڕۆژە خۆشەکانی لەگەڵ ڕوئیا پێدەدام.

بەڵام بەداخەوە مرۆڤ بەپێچەوانەی گومانەکانی هەرگیز ناتوانێت بەئاواتەکانی بگات. لەڕاستیدا نابێت چاوەڕوان بین ئاوات و هیواکان بەو شێوەی خواستی مرۆڤی لەسەرە، بێتەدی.

هەموو کەسێک دەبێت بەمە ڕازی ببێت کەهەرسات ئەگەری هەیە ڕووداو و کارەساتە چاوەڕواننەکراوەکان ڕێڕەوی ژیانی مرۆڤ بگۆڕن بەهەمانشێوە کەڕێڕەوی ژیانی

من بەشێوەیەکی لەناکاو گۆڕا و دۆخێک هاتەپێش، هەرگیز بیرم لێنەدەکردەوە.

بەرواری ئەو ڕۆژەم بەتەواوی لەبیر نییە، بەڵام نزیکەی دوو مانگم مابوو لەزیندان بێمەدەر کەحەمید هاتە سەردانم. ڕوخساری بەپێچەوانەی ڕابردوو نیگەران و خەمبار بوو. کاتێک لەهۆکاری نیگەرانیم پرسی، سەرەتا بەڵێنی لێوەرگرتم نارەحەت نەبم. کاتێک بەڵێنم پێدا، بێ پێشەکی وتی:

بەهمەن ڕوئیا دەیەوێت بڕواتە سەفەر.

بەبیستنی ئەو قسەیە حەپەسام، بێ ئیرادە هاوارمکرد: بۆ؟ بۆ حەمید؟ بۆ دەیەوێت بڕوات؟

هەوڵی زۆرمدا لەم سەفەرە پەشیمانی بکەمەوە بەڵام ئەو کەڕاستییەکان نازانێت، بەگومانی ئەوەی درۆی لەگەڵ دەکەم کەتۆ لەسەفەریت و بەخەیاڵی ئەوەی تۆ بۆ هەمیشە بەجێتهێشتووە، دوێنێ پێی وتم شوێنەکەی بەهمەن یا ناونیشانەکەیم پێبدە تا نامەی بۆ بنێرم و چوونکە وەڵامی نەرێنیم دایەوە، باسی سەفەری کرد. کاتێک هۆکارەکەیم پرسی وتی: تۆ هەموو شتێک دەشاریتەوە، بەهمەن منی لەبیر کردووە و گەرنا تا ئێستا دەهاتە سەردانم، تۆیش بۆ ئەوەی نیگەران نەبم، ڕاستییەکانم پێ ناڵێیت، منیش دەڕۆمە سەفەر بۆ ئەوەی کەمێک بحەوێمەوە.

بێ هیوا ئاوڕم بۆ حەمید دایەوە و وتم:

حەمید ئەگەر ئەو نەزانێت من لەکوێم، خۆ تۆ دەزانی!

بەڵێ دەزانم، هەوڵەکانم بۆ ڕازیکردنی ڕوئیا و ئەوەی تۆ لەسەفەریت، لەم ماوەدا بێسوودە و چیتر ئامادە نییە گوێ لەوتەکانم بگرێت و دەڵێت ئەگەر بەهمەن ڕۆشتۆتە سەفەر، لانیکەم ناونیشانەکەیم پێبدە تا نامەی بۆ بنێرم. ڕوئیا دەڵێت بەهمەن کەبەهیچ جۆرێک بەرگەی دووری منی نەدەگرت، چۆنە ئێستا چەندین مانگ بێ ئەوەی هەواڵم بزانێت و بپرسێت، ڕۆشتۆتە سەفەر. بەسەرنجدان بەم قسانە، چیتر ئامادە نییە گوێ لەوتەکانم بگرێت.

دوای چەند ساتێک بینیم حەمید ڕاست دەکات بەڵام منیش هیچ دەرەتانێکم نەبوو. من کەتا ئەمڕۆ ڕووداوەکەم بەنهێنی هێشتبوویەوە، چۆن دەکرا بەهۆی حەمیدەوە ڕاستییەکان بەڕوئیا بڵێم و ئەوەی کەئێستا لەزینداندام، نە، شتی وا نەدەکرا.

هەستم دەکرد بەمشێوەیە هەموو شتێک کۆتایی دێت و من ڕوئیا لەدەست دەدەم. لەوساتەدا بەتەواوی هەستم بەنەبوونی ڕوئیا کرد بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دڵنەوایی خۆم دەدایەوە بۆ ئەوەی بەرگری بکەم بەڵکو کاروبارەکان بەپێی دڵخوازی خۆم بڕواتە پێش، هەرچەند هێزی بەرگریکردنیشم نەما.

لەحەمید پاڕامەوە و داوای هاوکاریم کرد

بەئارامی و بەشێوەیەک نارەحەت نەبم، وتی:

بەداخەوە بەهمەن، ئەوەی دەمتوانی کردم، چیتر لەوە زیاتر ناتوانم هیچت بۆ بکەم.

لەکاتێکدا بەتەواوی پەرێشان و نارەحەت بووم، چەند جارێکی دیکە لەحەمید پاڕامەوە کەچۆنی بەباش دەزانێت کارێک بکات ڕوئیا لەسەفەرەکەی پەشیمان ببێتەوە. ئەویش بەڵێنیدا هەموو هەوڵێکی خۆی بخاتەگەڕ. دواتر ماڵئاوایی کرد و ڕۆشت. خەمبار و نیگەران بەرەو ژووری زیندان گەڕامەوە.

دڵم گیرابوو. لەسووچێکدا کزۆڵەم کرد و نوقمی دەریای بیرکردنەوە بووم. ئاسمان کەم کەم تاریک دەبوو. سێبەرە ڕووناکەکانی ژیان زیندانیان بەجێدەهێشت. بەدوای ئاوابوونی خەمبزوێن، تاریکی خەمبزوێنتەر بوو.

زەمان بێ درەنگ بەرەو پێشەوە دەڕۆشت و ڕووداوەکانی، هەرسات ژیانی کەسەکانی دەگۆڕی. منیش لەسووچێکی ئەم زیندانە، بیرم لەچارەنووس و ژیانی بەفیڕۆچووی خۆم دەکردەوە. دەگریام بێ ئەوەی بمەوێت. فرمێسکە تاڵەکانم لەقووڵایی دڵمەوە سەرچاوەی دەگرت و دەڕژایە سەر ڕوخسارم. هەستمکرد بۆ یەکەمجار وەک کەسێکی ناتەوان دەگریم، ئەویش گریانێکی تاڵ و کوشندە.

تەواوی ئەو پیاوانەی بەهەرهۆکارێک لەژیاندا ناچار بوون

بگرین، لەو دۆخە خەمبارەدا هەست بەحاڵی من دەکەن و باش دەزانن گریانی پیاو لەکاتی ناتەوانی، چەندە تاڵ و کوشندەیە. پیاو ئەگەر کاتێک خۆی بەڕیسوا و ناتەوان ببینێت و بەزۆر غرووری لێ بسێنن، چیتر زیندوو نییە. لەو ساتەدا منیش لەو حاڵە دابووم، چارەیەک نەبوو، دەبوا بسووتێم و دان بەخۆدا بگرم.

ئەوشەوەی زیندانم بەبیرکردنەوەی تێکەڵ و دڵێکی نیگەران کردە ڕۆژ. بۆ بەیانی لەژوورەکەم هاتمەدەر و بێ ئەوەی نان بخۆم، لەحەوشی زیندانەکە پیاسەم دەکرد. لەگەڵ کەس نەدەدوام و بەردەوام لەناو بیرکردنەوەی ئاڵۆزی خۆم دەتلامەوە. کاتی نیوەڕۆیش چوونکە حەزم لەخواردن نەبوو، نانم نەخوارد و تا ئێوارێ بەناو حەوشێکەدا سووڕامەوە و بیرم دەکردەوە تا ئەوەی حەمید هات.

ئەو هەواڵێکی ناخۆشی بۆ هێنابووم چوونکە لەگەڵ هەوڵەکانی، ڕوئیا بۆ شیراز سەفەری کردبوو.

بەبیستنی ئەم هەواڵە نارەحەت و خەمبار بووم بەڵام حەمید دڵنەوایی کردم و وتی چوونکە ماوەیەکی کەم لەزیندانییەکەی تۆ ماوەتەوە دەتوانی دوای ئازاد بوون لەزیندان بڕۆیتە شیراز بۆ لای ڕوئیا و لەگەڵ ئەوەی بۆ ئەم ماوەیە داوای لێبوردنی لێدەکەی، دەتوانی ژیانێکی خۆش لەگەڵ ئەو دەستپێبکەیت.

ئـەوەی ڕاستی بێت وتەکانی حەمید تا ڕادەیـەک ئارامی پێبەخشیم. داوام لێکرد تا ئازادی من بڕواتە شیراز و سەردانی ڕوئیا بکات و لەگەڵ دڵنەوایی کردنی پێی بڵێت من بەزویی لەسەفەرەکەم دەگەڕێمەوە.

حەمید بەڵێنیدا لەبەر من ئەو کارە دەکات.

دوای ئەوە حەمید ماڵئاوایی کرد تا بڕوات. لەکاتی ڕۆشتن داوای کرد نارەحەت نەبم. لەگەڵ ئەوەیشدا نامەیەکی ڕوئیای پێدام. نامەکە ڕوئیا نووسیبووی و دابووی بەحەمید تا بۆ منی بنێرێت.

دوای ڕۆشتنی حەمید، لەکاتێکدا دڵم بەخێرایی لێی دەدا، بەخێرایی گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم بۆ ئەوەی هەرچی زووتر لەناوەڕۆکی نامەکەی ڕوئیا ئاگادار ببمەوە. نامەکەم کردەوە و خوێندمەوە:

ڕوئیا نووسیبووی و چەند خەمبارانە نووسیبووی:

بەهمەنی ئازیز....

ئەم نامەیە لەکۆتایی ڕۆژێکی سارد و خەماویدا دەنووسم. ئاسمان لێوانلێوە لەهەوری ڕەش و دڵم گیراوە، تەنها وێنەی تۆم لەبەرچاوە و هاوشێوەی خەو لەناو چاوەکانمدا دەسووڕێت.

بەهمەنی ئازیز، ئەگەری هەیە ئەمڕۆ یەکێک لەخراپترین ڕۆژەکانی ژیانم بێت چوونکە بۆ یەکەمجار تامی تاڵی عەشقێکی

شکۆدارم چێشت.

ئەمڕۆ هەستمکرد چیتر منت خۆشناوێت و بۆ هەمیشە بەجێتهێشتووم.

گوڵە جوانەکەم، بەهمەنی ئازیزم، ئەوەندە بێ وەفا بوویت تەنانەت ئەو کاتەی لەنەخۆشخانە بووم، یەکجار سەردانت نەکردم، لەکاتێکدا چاوەکانم بەردەوام چاوەڕوانی تۆ بوون.

بەردەوام بیرم لەوە دەکردەوە کەتۆ ڕۆژێک سەردانم دەکەیت و کۆتایی بەو چاوەڕوانییە تاڵە دێنیت.

بەڵام بەداخەوە ئەم چاوەڕوانییە هەڵە بوو و تۆ تا دووایین سات کەنەخۆشخانەم بەجێهێشت، نەهاتی و چاوەکانم بۆ هەمیشە لەچاوەڕوانی تۆدا مایەوە.

هیوای ژیانم، ئازیزە خۆشەویستەکەم، خۆشم دەوێیت تا ڕادەی پەرەستن بەڵام بێ وەفا بوویت، تۆ بوویت بۆ هەمیشە منت بەجێهێشت و تەنانەت نامەیەکت بۆ نەنووسیم.

بەڵام بەهمەن ئەوە بزانە بۆ هەمیشە خۆشم دەوێیت و تا ئەو ڕۆژەی زیندووم بەعەشقی تۆ وەفادار دەبم.

تۆ گوڵی جوانی ژیانی منی، تۆ تەنیا پیاوێکی توانیت لەدڵی وێرانەی مندا هێلانە بکەیت، دڵنیابە بۆ من جگە لەتۆ هیچ پیاوێک بوونی نییە و نابێت. بەڵێن دەدەم!

بەهمەنی ئازیز، حەزم دەکرد ئەو ڕۆژەی دەمرم دڵم لەسینە

دەربێنی و بزانی چی لەسەر نووسراوە، ئەو ڕۆژە ئەگەر ئەم شانازییەم پێببڕێت، دەبینی لەسەر نووسراوە: خۆشم دەوێی بۆ هەمیشە.

ئازیزەکەم، بەهمەن گیان، چاوە جوان و سەرنجڕاکێشەکانی تۆ، ئیلهامبەخشی منە و بێ ئەوان هیچم، مردووم، بەڵام نازانم بۆ نەتویست چاوەکانت هی من بێت. نازانم.

نازانم بۆ بەجێهێشتم، نازانم.

گوڵی بۆنخۆشی ژیانم خۆزگە دەتزانی چەندە خۆشمدەوێیت و ئارەزوومە هەموو شتێکم لەگەڵ تۆ بێت و بێ تۆ هیچم هیچ.

بەهمەنە جوانەکەم، لەیلوپەڕی ژیانم، حەزم دەکرد بەو ئەندازەی من تۆم خۆشدەوێت، تۆیش منت خۆشبویستایە.

خۆزگە بیرت دەهاتەوە کەکچێک لەم زەمانە پڕ خراپەکارییەدا، لەتاریکاییەکانی ژیانی لەبەر عەشقێکی پاک دەسووتێت و دەبێتە خۆڵەمێش و ئەو عەشقە، عەشقی گەورەی تۆیە بەهمەن.

خۆشەویستەکەم، لانیکەم داوات لێدەکەم لەبیرم مەکە چوونکە هەرگیز فەرامۆشت ناکەم.

ئەمشەو کەشەوێکی تاریک و ڕەشە، لەبەر تۆ فرمێسک لەچاوەکانم دەبارێت و دەبێت بڵێم ئەمشەو شەوی فرمێسک و خەمە.

نها داخی هیوا لەدەستچووەکان دەخۆم و نازانم هۆکاری ئەم هەڵاتنە کتاوپڕەی تۆ چیبوو؟

بەهمەنی ئازیز، ئەگەر کچێک بەڕاستی عاشق ببێت، هەرگیز چیتر عاشقی پیاوی دووەم نابێت و سەبارەت بەتۆ، ئازیزی ژیانم، بەوشێوەم.

بەهمەنی ئازیز، هەرکات بینیت کچێک بەرەو گۆڕستان دەبن، بۆ یادی من چەند هەنگاوێک بەدوایدا برۆ و فرمێسک برێژە. چوونکە ئەو جەنازە وەک جەستەی بێ گیانی منە کەسووتاوە و بۆتە خۆڵەمێش و بەهەمانشێوە کە لەخاک ئافرێنراوە، ئەسپەردەی خاک دەکرێت.

بەهمەنی ئازیز، ئەمرۆ کەدەمەوێت شاری بیرەوەرییەکانم بەجێبێڵم، نازانی چەندە دژوارە. یەکەم رۆژی ئاشنایی، ئەو بەریەککەوتنە شیرینە و ئەو کاتژمێرە خۆشانەی پێکەوە بەسەرمان برد و بێ ئیرادە فرمێسک لەچاوەکانم دەبارێت.

فرمێسک بۆ عەشقێکی لەناوچوو و لەدەستچوو. عەشقێک کەهەمیشە لەدڵمدا دەمێنێتەوە بەڵام تۆ زوو فەرامۆشتکرد.

بۆ من خوا یەکە و بەهمەن یەک، ئەمە دروشمی هەرکچێکە کەبەرا□ستی کوڕێکی لەقووڵایی دڵەوە خۆش دەوێت.

بەهمەن، دەڕۆم و دڵنیام ڕۆژێک لەبەر ئەم جیابوونەوە پەشیمان دەبیتەوە و بۆ هەمیشە لەژیاندا داخ و ئەفسوس دەخۆیت کەبۆ عەشقەکەمان بێ ئەوەی بەرهەمی هەبێت،

شکستی هێنا.

بەڵام بەهمەن بیرت بێت تۆ بوویت ئەو عەشقەت شکاند بەڵام من هەرگیز باوەڕم بەشکاندنی عەشقی ڕاستەقینە نییە.

عەشقی ڕاستەقینە، هەمیشە دەمێنێتەوە و تەنانەت مەرگیش ناتوانێت شکۆی عەشقی ڕاستەقینە لەناو ببات.

بەڵام ئەم شکۆیە وادیارە بۆ تۆ شکاوە، ئەگەری هەیە من بەوشێوەیە گومان دەکەم.

بەپێچەوانەی خواست و تەنیا لەبەر ئەوەی تۆ ویستت و بەمشێوەیە پێت وتم کەفەرامۆشت کردووم، لەتۆ جیادەبمەوە لەکاتێکدا دڵم تەنیا لەبەر تۆ و عەشقی تۆ لێدەدات و تا ئەو کاتەی زیندووم، هەرگیز لەبیرت ناکەم. ماڵئاوا بەهمەن، ماڵئاوا ئازیزترین کەسی ژیانم، ماڵئاوا.

ئەو کەسەی هەرگیز لەبیرت ناکات، ڕوئیا.

کاتێک نامەکەی ڕوئیام خوێندەوە، بێ ئیرادە نامەکە لەدەستم کەوتەخوار. حەزم دەکرد هاوار بکەم و بەرۆئیا بڵێم بێ وەفا نیم و ئەم جیابوونەوەیە کاتییە. دەمویست لەوێ دەبوو و حاڵی منی دەبینی تا دەیزانی لەبەرچی زیندانی کراوم و بۆ سەردانم نەکردووە بەڵام بەداخەوە هاوارەکانم بێ ئەوەی بەگوێی بگات، لەقوڕگمدا دەخنکا و دووبارە نوقمی بیرکردنەوەی پەرێشان و تێکەڵ و پێکەڵ بووم.

# ٦

ڕۆژەکان و هەفتەکان بەدوای یەک تێدەپەڕین و سەرئەنجام دوای بەسەربردنی ماوەی زیندانییەکەم، ئازاد بووم. ئەو ڕۆژەی هەواڵی ئازادبوونیان پێدام، لەخۆشیدا ئەوەندەی نەمابوو شێت ببم. بەخێرایی ماڵئاواییم لەهەموو هاوڕێکانم کرد و لەکاتێکدا ئارەزووم دەکرد ئەوانیش بەزووترین کات ئازاد بکرێن، شادوومان و دەم بەبزە لەزیندان هاتمەدەر.

ڕۆژێکی قەشەنگی بەهاری بوو. وەنەوشەکان ڕەنگاوڕەنگ دەهاتنەبەرچاو. گەڵای دارەکان سەوز و سرووشت، خۆی ڕازاندبوویەوە.

قەشەنگی و جوانی بەهار، هێز و وزە بەمرۆڤ دەبەخشێت. نەسیمێکی فێنک لەناو گەڵاکاندا خۆی شاردبوویەوە و جارجار لەڕوخساری دەدام. ئارام و بێ خەیاڵ، دوای گوزەرکردن لەچەند شەقامێک ڕوومکردە شەقامە لاوەکی و قەرەباڵغەکانی شار.

ئێستا دوای ساڵێک زیندانی دووبارە لەناو خەڵکا بووم، هەستی ئازادی سەراسەری بوونمی داگیرکردبوو. لەجموجۆڵی خەڵک چێژم وەردەگرت.

ئەوان ئازادبوون و ئەوەی دەیانخواست، ئەنجامیان دەدا، ماوەیەک نوقمی بیرکردنەوەی ئاڵۆز، سەرنجی خەڵکم دەدا و دواتر بەناو شار و شەقامەکاندا سووڕامەوە. دەنگدانەوەی دەنگەکان جۆرێکی دیکە بوو. کچ و کوڕە ئارەزوومەندەکانم دەبینی کەدەست لەناو دەست، لەسەر شۆستەکان پیاسەیان دەکرد و نەخشەیان بۆ داهاتوو دەکێشا. دەستگێڕەکانم دەبینی بەدەنگی گەرمی و سەرنجڕاکێشی خۆیان دەیانقیژاند بۆ ئەوەی کەلوپەلەکانیان بفرۆشن. بەردەم سینەماکان قەرەباڵغ بوو و خەڵک بۆ ڕۆشتنە ناو سینەما ڕیزیان بەستبوو. پیر و گەنج و گەورە و بچووک هەرکام بەکارێکەوە سەرقاڵ بوون و جموجۆڵی ئەوان هەوڵدان بۆ ژیانێکی باشتر بوو.

گڵۆپە ڕەنگاوڕەنگەکان جوانییەکی تایبەتیان بەشار بەخشیبوو. وەک ئەوەی یەکەمجار بێت هاتبێتمە ئەم شارە، حەزم دەکرد دوای ساڵێک ئازار و بەدبەختی و زیندانی بوون، ئازادانە بەناو شارەکەدا بگەڕێم و بیرەوەرییەکانی ڕابردووم زیندوو بکەمەوە.

چەندین کاتژمێر بێ مەبەست و تەنیا لەبەر دووبـارە بەدەستهێنانەوەی ئازادی بەناو شارەکەدا سووڕامەوە. نزیک نۆی شەو، شەکەت و ماندوو، لەکاتێکدا لەکۆتایی هاتنی زیندان شادوومان بووم، بەرەو ماڵی حەمید ڕۆشتم.

ئەو لەبینینیم شادوومان و یەکترمان لەئامێزگرت و بێ ئیرادە فرمێسک بەچاوەکانمدا هاتەخوار. حەمید بۆ ئەوەی لەو ساتەخۆشەدا لەنەبوونی ڕوئیا نیگەران نەبم، بەپێکەنینەوە وتی:

بەهمەن، هەموو شتێک کۆتایی هـاتووە و تۆ پیاوێکی بەختەوەریت، هەرچەند ساڵێکی پڕ بەدبەختیت لەزیندان گوزەراند، بەڵام ئێستا کەئازادبوویت دەتوانی بڕۆیتە شیراز بۆ لای ڕوئیا و ژیانێکی تازە دەستپێبکەیت.

تا ئەو جێگەی من بزانم، ڕوئیا لەشیراز و لەماڵی مامی نیشتەجێبووە. تۆ دەتـوانـی لـەو شـارە ڕوئیا بدۆزیتەوە و سەبارەت بەژیانی داهاتووتان بڕیار بدەن. بەدڵنیاییەوە ژن و مێردێکی بەختەوەر دەبـن. ڕوئیا ئێستا ئـالـوودە نییە و دەتوانن دوای پەیوەندی هاوسـەرگیری، ژیانێکی بەختەوەرانە دەستپێبکەن و دوای ئەو هەموو ڕەنج و بەدبەختییە، ڕۆژانێکی خۆش بەسەر بەرن.

لەگەڵ ئەوەی سوپاسی حەمیدم کرد، لەبەر ئەوەی هیلاک بووم و جیاواز لەوە نەمدەویست ببمە ئەرک بۆ حەمید، لەشوێنەکەم هەستام بۆ ئەوەی ماڵئاوایی لێبکەم بەڵام ئەو ڕێگەی نەدا بڕۆم و فرمانی بەخزمەتکارەکەیاندا لەژوورەکەی جێگەیەکی زیادە ئامادە بکات. ئەو شەوە لەوێ مامەوە.

ئێوارێی ڕۆژی دواتر، حەمید بڕە پارەیەکی وەک قەرز پێدام و دوای کڕینی بیتاقەی شیراز، لەکاتێکدا بۆ ماڵئاوایی کردن هاتبووە گاراژ، سوار پاسەکە بووم. چارەکێک دواتر، لەکاتێکدا حەمید دەستی ماڵئاوایی بەرزکردبوویەوە، پاسەکە بەرەو شیراز بەڕێکەوت.

پاس بەناو شەقامە قەرەباڵغەکانی شار تێپەڕی و ڕۆشتە سەر شەقامێک کە بەجادەی شیراز کۆتایی دەهات.

ئاسمان ڕەنگی شینی تاریک و زۆربەی دووکانەکان گڵۆپەکانیان داگیرساندبوو. پاسەکە دوای بەجێهێشتنی دووایین شەقام، گەیشتە سەر جادەی شیراز.

دڵم بەتوندی لێیدەدا. بیرم لەوە دەکردەوە لەشیراز چۆن ڕووبەڕووی ڕوئیا ببمەوە؟ ڕاستییەکەی تەنیا بیرکردنەوە لەو چرکەساتە، سەرمەستی دەکردم. حەزم دەکرد کاتێک دەگەمە ئەوێ، لەگەڵ دابەزین لەپاسەکە، ڕوئیا بدۆزمەوە و بەهۆی دیارنەبوونم لەم ماوەدا داوای لێخۆشبوونی لێبکەم.

بەهۆی ئەو سەفەرەی پێشووم بۆ شیراز و بۆ ماڵی خوشکم، بیرەوەرییەکی خۆشم لەڕۆشتن بۆ ئەو شارە نەبوو، بەڵام ئەمجارە مەبەستم ماڵ خوشکم نەبوو. هەرچەند دەمتوانی لەماڵە خۆشەکەی ئەودا بمێنمەوە بەڵام بەهۆی هەڵسوکەوتی لەسەفەرەکەی پێشوومدا، ئامادەبووم لەسەر شەقام بخەوم بەڵام نەچمە ماڵەکەی ئەو.

هەستم دەکرد لێی بێزارم، ئەو ژنێکی پەست بوو کەسەروەت و سامان کوێری کردبوو و گرنگی بەهیچ شتێک و هیچ کەسێک نەدەدا.

خوشکەکەم لەگەڵ ئەو هەموو سامانە، دەهەزار تمەنی پێنەدام لەکاتێکدا نزیکترین کەسی ئەوم. لەبەر ئەو پارەیە ناچاربووم یەک ساڵ لەزینداندا بمێنمەوە.

دوای زیندان، بڕیارمدا نەتەنیا لەخوشکم بەڵکو لەهەموو کەسوکارم خۆم بەدوور بگرم. لێیان بێزار بووبووم چوونکە منیان بەکەسێکی دەستپاک نەدەزانی لەکاتێکدا خۆیان خاوەنی چەندین میلیۆن سامان بوون و نەیانویست بڕێکی وەک قەرز بەمن بدەن.

ڕاستە کەدەڵێت دەستەیەک تا پارەی زیاتریان هەبێت، لەمرۆڤبوون دوور دەکەونەوە. لەناخی کەسە دەوڵەمەندەکانی تایەفەکەی منیش، پیاوەتی و مرۆڤبوون مردبوو. ئەوان تەنانەت

لەکاتی زیندان سەردانیان نەکردم و بۆ یەکجاریش هیچکامیان نەیانویست بزانن بۆ دەستم بۆ دزی درێژ کردووە؟ تەنانەت باوکم یەکجار سەردانی نەکردم بۆ ئەوەی ڕاستییەکان لەزمانی خۆمەوە ببیستێت.

کەواتە بەمشێوە و لەسەر داوای خۆیان، چیتر بوون لەناو ئەم خێزان و کەسوکارەکەدا مانایەکی نەمابوو و لەڕاستیدا لەنێوان من و ئەواندا لەمپەرێکی گەورە هاتبووە ئاراوە کەتا کۆتایی تەمەنم مایەوە.

بەمشێوە، سەبارەت بەپچڕاندنی پەیوەندیم لەگەڵ خێزان و کەسوکار، لەدادگای ویژدان پاساوم بۆ خۆم هێنایەوە. بەدرێژایی ڕێگە جگە لەڕوئیا بیرم لەهیچ شتێکی دیکە نەکردەووە. کاتێک گەیشتمە شیراز، بێ ئەوەی بیر لەوە بکەمەوە خوشکێکم لەم شارەدا ژیان بەسەر دەبات، ڕۆشتمە میوانخانە و ژوورێکم بەکرێ گرت.

دوای ڕێکخستنی کاروبارەکان، بۆ دۆزینەوەی ڕوئیا لەمیوانخانە هاتمەدەر و بەدوای ناونیشانی ڕوئیا، یانی ماڵی مامی گەڕام.

ماوەیەکی زۆر لەسووچی شەقامەکە چاوەڕێ بووم بەو هیوایەی ڕوئیا لەماڵی مامی بێتەدەر بەڵام نەتەنیا ڕوئیا، بەڵکو کەس لەو ماڵە نەهاتەدەر. لەبەر ئەوە بڕیارمدا هەرچۆنێک

بووه سەبارەت بەڕوئیا هەواڵێک بزانم. بەم بیرۆکە، ڕۆشتمە دووکانی سەر کۆڵانەکە و لەپیرەپیاوی خاوەنەکەی کە لەپشت کێشانەکەوە وەستابوو، پرسیارمکرد. دوای کڕینی ساردییەکی فێنک، سەبارەت بەمامی ڕوئیا لەو کابرا پیرەم پرسی و تێگەیشتم ئەوان ڕۆژی پێشوو بۆ یەکێک لەڤێلاکانی دەرەوەی شیراز ڕۆشتوون.

بەبەدەستهێنانی ئەم هەواڵە لەو پیرەپیاوە، چیتر چاوەڕوانیم بەرەوا نەبینی و لەدووکانەکە هاتمەدەر و دووبارە بۆ میوانخانەکە گەڕامەوە.

ئەو شەوە تا بەیانی خەوم لێنەکەوت. بەردەوام بیرم لەڕوئیا دەکردەوە، ماوەیەک بەخۆم دەوت کاتێک بمبینێت، بەناڕەحەتی پشتم تێدەکات و من لەخۆی دەتارێنێت و هەندێکات لەخەیاڵدا ڕوئیام دەبینی لەگەڵ پیاوێکی دیکە تێکەڵ بووە.

هەندێ ساتیش خەیاڵم دەکردەوە کەڕوئیا لەبینینم شادوومان دەبێت و هەردووک پێکەوە دەگرین.

بەڵام هەمووی ئەمانە تەنیا خەیاڵێکی پڕوپووچ بوو. خەیاڵێک بوو زۆربەی عاشقان لەکاتی بیرکردنەوە لەخۆشەویستەکەیان، بۆیان دروست دەبێت و پێی دڵخۆش دەبن. ئەو شەوە منیش لەم بارودۆخەدا بووم و هەرچی هەوڵمدا بخەوم، نەمتوانی، ئەوەندە لەسەر جێگەکەم ئەملاولام کرد، کاتێک سەرم

بەرزکردەوە، بینیم خۆر هەڵاتووە.

کاتێک خۆر لەپشت چیاکانەوە وەک بووکێکی ڕازاوە، سەری دەرهێنا، لەجێگەکەم هاتمەدەر و دوای خواردنی نانی بەیانی، بڕیارمدا ئەو ڕۆژە سەردانی هەموو شوێنە گەشتیارییەکانی شیراز بکەم.

سەرەتا ڕۆشتمە ئارامگای حافز و دواتر ڕۆشتمە ئارامگای سەعدی و دواتر سەردانی چەند شوێنێکی دیکەی شیرازم کرد و دوا نیوەڕۆ بێ مەبەست بەناو شەقامەکاندا دەسووڕامەوە و شەکەت و ماندوو بۆ میوانخانەکە گەڕامەوە وخەوتم. بەیانی ڕۆژی دواتر ڕۆشتمە تەختی جەمشید و ئێوارێکەی بۆ شیراز گەڕامەوە و سەردانی شوێنەوارەکانی کەریمخانی زەندم کرد. کاتێک لە(ئەرکی) شیراز گوزەرم کرد، لەناکاو دیمەنێکی چاوەڕواننەکراو سەرنجی ڕاکێشام. سەرەتا گومانم کرد هەڵە دەکەم بەڵام کاتێک وردبوومەوە، بینیم ئەوەی دەیبینم، ڕاستییە.

لەناو ترۆمبێلێکی ڕەنگ لیمۆیی، کە لەسووچێکی گۆڕەپانەکەدا پارک کرابوو، ڕوئیا دانیشتبوو و گۆڤاری دەخوێندەوە.

حەپەسام. ویستم بڕۆمە پێش کەپیاوێک لەپشت دووکانێکی نانەوایی هاتەدەر و سوار ترۆمبێلەکە بوو. پێش ئەوەی بتوانم

هەنگاوێک بڕۆمە پێش، ترۆمبێلەکە ڕۆشت.

ترۆمبێلەکە ڕۆشت و من سەرسوڕماو لەشوێنەکەدا چەقیم و سەیری شوێنە خاڵییەکەم دەکرد.

سەرئەنجام دوای ماوەیەک وەستانی بێهۆ، لەسووچێکی شەقامەکە، نارەحەت بەرەو شەقامێکی لاوەکی بەڕێکەوتم.

ئاسمان تاریک و تیشکی خۆر دیارنەبوو. بایەکی فێنک هەڵیکرد و قژی پەرێشان کردم. بیرم لەو پیاوە غەریبەی ناو ترۆمبێلەکە دەکردەوە کەتا ئەوساتە نەمبینیبوو. بیری ئەوەی نەکا ڕوئیا ئەم پیاوەی خۆشبوێت، ئازاری دەدام بەلام هەوڵمدا تا ڕوونبوونەوەی ڕاستییەکان هیچکارێک نەکەم، لەگەڵ ئەوەیشدا هەستمکرد بەتەواوی توانای تێگەیشتنم لەدەستداوە و شێت بووم.

هەستمکرد عەشقەکەم لەناوچووە. سوێندم خوارد ئەگەر ئەم کەسە هاوڕێی ڕوئیا بێت، تۆڵەیەکی مەترسیداری لێ دەستێنم بەلام نازانم بۆ کاتێک بیرم لەتۆڵە دەکردەوە، نەمدەتوانی دژی ڕوئیا هیچکارێک بکەم، دڵم بەتەواوی ڕێگەی بێزاربوون لەڕوئیای لێدەگرتم چوونکە هەستمدەکرد لەقوولایی دڵمەوە ڕوئیام خۆشدەوێت.

من بڕوام بەڕوئیا بوو. دڵنیابووم بەهەمانشێوەی بۆی نووسیوم هیچکات تێکەڵ بەپیاوێکی دیکە نابێت بەلام ئەو

پیاوە کێ بوو. هەرچی بیرمکردەوە، بەهیچ شتێک نەدەگەیشتم، تەنیا چارە ئەوە بوو چاوەڕێ بم تا ئەو کاتەی ڕوئیا دەبینم.

بەدەم بیرکردنەوە و ڕۆژێکی دیکەم بەسەر برد تا ئەوەی ڕۆژی دواتر لەکاتی چوونەدەر لەمیوانخانە بەشێوەی ڕێکەوت ڕوئیام بینی کە لەشۆستەکە دەپەڕییەوە. بەتەواوی نازانم چیم بەسەرهات بەڵام دەزانم دەلەرزیم، فرمێسک لەچاوەکانم قەتیس مابوو. ڕوئیا لەچەند هەنگاویمدا بوو، بەڵام نەمدەتوانی بڕۆمە پێش، لەشوێنەکەم وشکبووم.

ئەو هاتەپێش، تا ئەوەی بەتەواوی لێم نزیکبوویەوە. بەدەنگێکی کز کەدەتوت لەقووڵایی چاڵێکەوە دێت، بێ ئیرادە وتم:

تۆیت..... ڕوئیا

هیچی نەوت.

بەئارامی دەستم درێژکرد و دەستیم گرت. هەردووک بێدەنگ بووین. ساتێکی نەشیاو بۆ وەسفکردن بوو، زمانێک باشتر لەبێدەنگی. فرمێسک لەچاوی هەردووکمان کۆبوویەوە. ماوەیەک بەمشێوەیە تێپەڕی. بێ ئەوەی هیچ بڵێین لەسەر شۆستەکە بەڕێکەوتین.

بەهۆی ئەم دیدارە کتاوپڕە، زمانی هەردووکمان گیرا. من و ڕوئیا کەدوای ماوەیەکی زۆر یەکترمان دۆزیبوویەوە،

هیچکام توانای قسەکردنمان نەبوو.!

لەگەڵ ئەوەی دەمویست هاوار بکەم و لەئامێزی بگرم و پێی بڵێم خۆشمدەوێت و لەم ماوەدا لەبەر ئەو زیندانیکرابووم، بەڵام نەمتوانی، یانی توانای دەربڕینی ئەم نهێنییانەم نەبوو، لەوانەیە دڵم نەیدەویست ئەو بزانێت کە لەماوەدا لەبەر ئەو زیندانی بووم.

ئامادەبووم ئەو بەبێوەفا ناوم ببات بەڵام هیچکات لەڕووداوی دزییەکە و هۆکاری زیندانیبوونەکەم شتێک نەزانێت. بەڵام هەرچۆنێک بووە دەبوا پێکەوە قسە بکەین چوونکە بێدەنگی زیاتر لەوە ڕەوا نەبوو.

بۆ ئەوەی بێدەنگی بشکێنم و لەگەڵ ئەوەیشدا باشتر بتوانم قسەی لەگەڵ بکەم، پێشنیارمکرد بڕۆینە شوێنێک و دانیشین و دوای ئەم ماوە دوورودرێژە پێکەوە گفتوگۆ بکەین.

ڕازی بوو، ڕۆشتینە چایخانەیەک، داوای چایی کرد. کاتێک چایچی، چای هێنا، سەرقاڵی خواردنەوەی چایی بووین و دەستیکرد بەگلەیی و گازندە لەمن و بەکورتی تا توانی سکاڵای کرد. بێدەنگ بووم و هیچم نەوت. هەستمدەکرد دڵم دەیەوێت بەرەو لای بفڕێت. بەهەموو بوونمەوە دەمپەرەست و بەو مەرجانەی بووی، شیاوی پەرەستن بوو. ڕوئیا بەردەوام باسی بێوەفایی منی دەکرد و منیش بێدەنگ گوێم لەوتەکانی دەگرت.

دوای ئـەوەی قسەکانی هێنایە سەرزمان و گلەییەکانی کرد، پارەکەمدا و بۆ ئەوەی کەڵک لەهەوای پاک وەربگرین، لەچایخانەکە هاتینەدەر و بـەرەو شەقامێکی چۆڵ کە بەدەرەوەی شار کۆتایی دەهات، بەڕێکەوتین. کاتێک گەشتینە کۆتایی شەقامەکە، لەشوێنێکی چۆڵ، لای دارچنارێکی کۆن وەستاین. لەمکاتەدا خۆی خستە ئامێزم و گریانی دەستپێکرد. هەرچۆنێک بوو ئارامم کردەوە.

لەوساتە شکۆدارەدا هەستمکرد جارێکی دیکە بیرەوەری ئاشناییمان زیندوبۆتەوە و عەشقەکەمان دووبارە ژیاوەتەوە. وەک ئەوەی هەموو ڕەنج و ئازارەکانمان کۆتایی هاتبێت و ئێستا خۆمان بەبەختەوەر دەزانی.

ئەو ڕۆژە دووبارە بەختەوەریم دۆزییەوە و بۆ ئەم دیارییە، لەدڵەوە هەستم بەشادوومانی دەکرد. چەندین کاتژمێر قسەی لەگەڵ کردم و بەهۆی قسەکانییەوە تێگەیشتم هێشتا بە من وەفادارە.

کاتێک سەبارەت بەترۆمبێلە لیمۆیی ڕەنگەکە و ئەو پیاوە غەریبە لێم پرسی، بزەیەکی گرت و وتی: ئەو گەنجە کوڕە مامیەتی.

بەبیستنی ئەم قسەیە شادوومان بووم. دوای ئەوە ڕوئیا بابەتەکەی گۆڕی و ئاگاداری کردمەوە ماڵە مامی تا دوو

ڕۆژی دیکە دەڕۆن بۆ تاران بەڵام ئەو لەبەر من و بەبیانویەک لەشیراز دەمێنێتەوە.

لەم بڕیارەی ڕوئیا شادوومان بووم. لەبەر ئەوەی درەنگی بوو، تا نزیک ماڵی مامی گەیاندم و بڕیارماندا لە ماوەی ئەم دوو ڕۆژەیشدا چاومان بەیەک بکەوێت.

ئەوسا لەکاتێکدا هەردووک لەم جیابوونەوە کاتییە ناڕەحەت بووین، ڕۆشتینە سەر ئەو شنەقامەی ماڵی مامی لەوێ بوو، ماڵئاواییمان کرد و ئەو ڕۆشت. بەهەمانشێوە کەسەیری دووربوونەوەیم دەکرد، بینیم دووبارە دەستی بەنیشانەی ماڵئاوایی بەرزکردەوە و دواتر ڕۆشتەژوور.

گەڕامەوە بۆ میوانخانە و بەبیرکردنەوەی تێکەڵ بەشادوومانی خۆم سەرقاڵکرد. بینینی کتوپڕی ڕوئیا تایبەت بوو. هیوادار بووم بتوانین چەند ڕۆژێک دوای ڕۆشتنی ماڵی مامی بۆ تاران، کاتەکانمان لەشیراز پێکەوە بەسەر بەرین و سەبارەت بەداهاتوو و ژیانی خۆمان گفتوگۆ بکەین.

بەمشێوەیە چاوەڕێ بووم تا ئەوەی دوای چەند دیداری کورت لەدوای ئەو ڕۆژە، ئێوارێی دووەم ڕوئیا ئاگاداری کردمەوە کەمام و خزمەکانی بەرەو تاران بەڕێکەوتوون و ئەو بەبیانووی حەوانەوەی زیاتر لەگەڵ خزمەتکارەکەی مامی لەشیراز ماوەتەوە.

ئەو شەوەی مامی ڕوئیا ڕۆشت، ئێمە چاومان بەیەککەوت و بڕیارماندا ڕوئیا بەجۆرێک خزمەتکارەکەی مامی ڕازی بکات کەسەبارەت بەمن هیچ لای ئەوان نەدرکێنێت و من و ئەو چەند ڕۆژێک بۆ گەڕان و پیاسە بڕۆینە یەکێک لەناوچە دڵگیرەکانی شیراز.

ئەو خواستەمان هاتەدی و ڕۆژی دواتر من و ڕوئیا، دوای بەڵێن وەرگرتن لەخزمەتکارەکەی مامی، بەپاس بەرەو گوندێکی دڵگیر لەپانزە کیلۆمەتری شیراز بەڕێکەوتین.

چەند سات دواتر، پاسەکە شاری شیرازی بەرەو گوندی ئاماژەپێدراو بەجێهێشت لەکاتێکدا من و ڕوئیا لای یەک بووین.

ڕوئیا لەهەمیشە جوانتر و سەرنجڕاکێشتر بەرچاو دەکەوت.

بایەکی فێنک لەدرزی شووشەکەوە دەهاتە ناو پاسەکە و قژە زەرد و جوانەکەی ڕوئیای پەرێشان دەکرد. ئەو بێدەنگ و ئارام سەرقاڵی سەیرکردنی کوێستانە سەرسەوزەکانی دەوروبەری جادەکە بوو.

لەداوێنی ئەم کوێستانانە، خەڵکی دێهات سەرقاڵی هەوڵدان بۆ دابینکردنی ژیانی داهاتووی خۆیان بوون. ژن و پیاو شان بەشانی یەک کاریان دەکرد. شوانەکان ڕانەکانیان لەداوێنی کوێستانەکان بەرەڵا کردبوو و خۆیان لەژێر دارێکدا سەرقاڵی ژەنینی شمشاڵ بوون. ڕوئیا نوقمی جوانی خۆڕسک، لەکاتێکدا

زۆر بەوردی سەیری ژیانی ئەو خەڵکەی دەکرد، ڕوویکردە من و وتی: بەڕاستی ئەم خەڵکە چەندە بەختەوەرن، بەوپەڕی پاکی کار دەکەن، عاشق دەبن و ژیان بەسەر دەبن.

دڵیان شوێنی ڕق و بێزاری شارییەکانی تیا نابینتەوە. دڵ و زمانیان وەک یەکە، ئەگەر کچیان عاشق ببێت، شێتە. شێتێکی ڕاستەقینە بەدڵێکی پاک و ئەگەر کوڕیان عاشق ببێت، بۆ هەمیشە بەعەشقەکەی وەفادار دەبێت. وانییە؟

قسەکەیم پشتڕاستکردەوە. دووبارە بۆ ماوەیەک بێدەنگ بووینەوە، بەڵام ناو پاسەکە قەرەباڵغ بوو. کچ و کوڕ پێکەوە قسەیان دەکرد و پیرەپیاو و پیرێژنەکانیش پێکەوە.

هەرکام سەبارەت بەشتێک قسەیان دەکرد و هەندێکات دەنگەکان بەڕادەیەک بەرز دەبووینەوە، مرۆڤ هەستی دەکرد شەڕ دەستپێکردووە.

بەڵام لەڕاستیدا هیچ شەڕێک لەئارادا نەبوو و ئەم دەنگە دەنگە لەگفتوگۆی هاوڕێیانە و گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی ئەوانەوە سەرچاوەی دەگرت.

من و ڕوئیایش نوقمی تەماشای یەکتر بووین، وەک ئەوەی هەستمان بەبوونی ئەو کەسانە نەدەکرد. ڕوئیا بێدەنگ و ئارام دانیشتبوو و گومانی دەکرد من لەتەماشای ڕوخساری جوانی چێژ وەردەگرم. ڕوخساری ئەوەندە پاک و خۆشەویست بوو

بەزمان ناتوانم وەسفی بکەم. دڵم بێ ئیرادە لێی دەدا. وەک فریشتەیەک دەهاتەبەرچاوم کەجگە لەپاکی و خۆشەویستی هیچی دیکەی لێ نەدەبینرا. ڕوئیا فریشتەیەک بوو پاک و بێ تاوان، چاوەکانی سیحراوی و ئەفسوونکەر و منیش هەستم دەکرد پێویستە ڕێزی ئەم فریشتەیە بگرم.

نوقمی ئەم بیرکردنەوە شیرینە بووم کە لەناکاو دەنگی ستۆپی پاسەکە ڕایچڵەکاندم. گەشتبووینە شوێنی مەبەست.

ئێرە گوندێکی جوان و دڵگیر بوو.

کاتێک لەپاسەکە دابەزیم. کچ و کوڕە منداڵەکانی گوندەکە لەکاتێکدا سەوەتەی میوەیان لەسەر سەردانابوو، بەرەو پیرمان هاتن.

دەنگەدەنگێکی سەیر لەپاسەکە دروستبوو. بڕێک میوەم لەکوڕێکی دێهاتی کڕی و ڕوئیایش گوڵێکی سووری لەکچێکی دێهاتی بەدیاری وەرگرت. میوەکانم بەرۆئیادا و ئەویش گوڵە سوورەکەی پێشکەش کردم. دواتر لەکاتێکدا دەستمان لەناو دەستی یەکدابوو، لای خەڵکان گوزەرمانکرد و بەرەو ماڵەکانی گوند بەڕێکەوتین کەدوورتر لەو شوێنە بوو. کاتێک گەشتینە ناو گوند، بەڕێنوومایی خەڵکەکە، ڕۆشتینە ماڵی کوێخا و خۆمان بەژن و مێرد ناساند و پێمان وت بەمەبەستی مانگی هەنگوینی هاتووینەتە ئێرە و لەمەبەستی خۆمان بۆ مانەوەی چەند

ڕۆژەمان لەوێ ئاگادارمان کردەوە. ئەویش بەخۆشحاڵییەوە ماڵی پیرێژنێکی حەفتا ساڵەی نیشانداین کەژووری بەکرێ دەدا. ئێمەی پێناساند و پێشنیاریکرد بەشێوەیەکی ڕێکوپێک میوانداریمان بکات.

پیرێژنی پشت چەماوە، بەباشی پێشوازی کردین و ژوورێکی خاڵی لەتەنیشت ژوورەکەی خۆی بۆ ئامادە کردین. سوپاسی ئەو پیرێژنە دێهاتییە دڵزیندووەمان کرد و لەبەر ئەوەی نزیک نیوەڕۆ بوو، ڕوئیا هێلکەوڕۆنی دروستکرد. نانمان خوارد و لەبەر ئەوەی ڕوئیا هیلاک بوو، حەواینەوە.

دەمەوئێوارێ بۆ پیاسەکردن و گەڕان لەکوێستانەکانی دەوروبەری گوندەکە هاتینەدەر. ئاسمان ساف و شین بوو. خۆر بە لەدەستدانی دووایـن تیشکە سوورەکانی لەپشت چیاکانەوە خۆی شاردەوە. چیاکان سەرسەوز و داوێنەکان بەگوڵ داپۆشرابوون.

لەگەڵ ڕوئیا بەناو گوڵە وەحشییەکاندا دەگەڕاین. کاتێک گوڵێکی سووری وەحشی دەبینی، لێی دەکردەوە و دەیدا بەمن و منیش گوڵەکانم کۆکردەوە و چەپکێکی جوانم لێدروست کرد.

بەدەوری گوڵە سوور و ڕەنگاوڕەنگەکان ڕاماندەکرد تا ئەوەی گەشتینە لای تاقەدارێک لەنزیک جۆگەیەکی ئاو.

هـەردووك لەبەرابەر تاقە دارەكە وەستاین. گوڵە وەحشییە شكۆفەكردووەكان بەماچی تیشكی خۆر، دەورانـدەوریـان گرتبووین. ئاو بەدەنگی تایبەتی خۆی لەباریكە ڕێگەییێكەوە گوزەری دەكرد و لەسووچێكی ئاسمانی شینڕەنگ كەكەم كەم بەرەو تاریكی دەڕۆشت، دوو كۆتری ڕەش و سپی دەبینران. لەكاتێكدا سەرمەست لەجوانی سروشت بووم، لەژێر كاریگەری ئەو بارودۆخە، بەنائاگا، ڕوئیام لەئامێز گرت و ماچم كرد.

لەبەرابەر ئەم ماچە بێدەنگ بوو. ساتێك دواتر بزەیەكی هێنایەسەر لێو و سەیری چاوەكانی كردم.

جارێكی دیكە لەئامێزم گرت و لێوم خستە سەر لێوی. ئەمجارە وەك كەسێك كە لەخومارییەكی بەردەوام هاتبێتەدەر، دەستەی لەدەوری گەردنم ئاڵقە كرد و لێوە سووتێنەرەكانی خستە سەر لێوم.

بەهەرماچێك زیاتر گەرم دەبووین و چەند سات دواتر گەرمی جەستەییم هەستپێكرد. وەك شكۆفەیەك لەئامێزی دارێكدا، سەری خستبووە سەر شانەكانم و قژی لەڕوخسارم دەسوو.

لەم كاتە كەبەردەوام ماچی لێوی یەكمان دەكرد بەدەنگێكی لەرزان وتی:

دەترسم.... بەهمەن.... دەترسم.

وتم: بۆچی؟

وەڵامــی نــەدایــەوە. دەســتــم لــەکــەمــەری کــردەوە. گوڵە سوورەکان لەدەستم کەوتەخوار. ئەو دەگریا. گومانمکرد لەوانەیە لەکارەکەی من ناڕەحەت بووبێت. لەبەر ئەوە باوەشم پیاکرد و لەگەڵ ئەوەی بۆ ئەو کارە کتاوپڕەم داوای لێبوردنم لێکرد، سوێندی خۆشەویستیم بۆ خوارد.

چاوە فرمێسکاوییەکانی بۆ لای من سووڕاند و بزەیەکی ناسک لێوەکانی ڕازاندەوە. لەوەڵامدا وتی:

بەهمەن منیش سوێند دەخۆم تەنانەت ئەگەر دوای سەد ساڵ لەمەرگم گۆڕەکەم هەڵبدەیتەوە و دڵم مابێت، دەبینی لەسەری نووسراوە: تەنیا تۆم خۆشدەوێت.

لەکاتێکدا بێ ئیرادە دەگریایین، لەئامێزی یەکدا نغرۆ بووین و سوێندی وەفاداریمان خوارد، سوێندمان خوارد عەشقەکەمان بۆ هەمیشە پایەدار بێت بەشێوەیەک تا ئێستایش یەک سات لەو عەشقە پاکە بێ ئاگا نیم.

لـەو ساتە لەبیر نـەکراوانـە، بۆ مـاوەیـەک لای ئـەو تاقە دارە ماینەوە و دواتر بڕێک لەگوڵە جوانەکانی سەرزەویمان کۆکردەوە و بەرەو گوندەکە گەڕاینەوە.

لەناوەڕاستی ڕێگە گەشتینە داوێنی کوێستان. کۆسارێک بوو قسەکردن و هـاوار، دەنگیدەدایەوە. لەو شوێنەدا بوو

لەسەر داوای ڕوئیا وەستاین و لەکاتێکدا چاوی بڕیبووە چاوەکانم، قیژاندی:

بەهمەن...... خۆشمدەوێیت.

دەنگ لەناو کۆسارەکەدا لوولی خوارد و دەنگیدایەوە.

لەوەڵامدا هاوارمکرد:

منیش دەتپەرەستم و ئامادەم گیانم......

دەستی خستەسەر لێوم و نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم بەڵام دەنگدانەوەی هاوارەکەمان بیست.

بەدەم قاقای پێکەنین ڕێگەی گەڕانەوە بۆ گوندەکەمان گرتەبەر.

دوای نیو کاتژمێر ڕێگە ڕۆشتن گەشتینە گوندەکە. لەبەرابەر دەرگای چوونەژوورەوەی ژوورەکەمان، پیرێژنی خانەخوێ پێشوازی لێکردین و بۆ سەرسفرە بڕێک ماست و سەوزەی پێداین. سوپاسمانکرد و ڕۆشتینە ژوور و دوای خواردنی نانی ئێوارێ، گفتوگۆمان دەستپێکرد.

لەو ساتە لەبیرنەکراوانەی لای یەکبووین، خۆم بەبەختەوەرترین پیاوی سەرزەوی دەبینی. لەو ساتە خۆش و تێپەڕانەی من و ڕوئیا، چەندینجار سوێندی خوارد لەقووڵایی دڵییەوە منی خۆشدەوێت و من لەبەرابەر ئەو عەشقە پاکە خۆم بەناتەوان دەبینی.

ڕاستییەکەی لەبەرابەر دەربڕینی عەشقی ئەو هیچم نەبوو بیڵێم جگە لەوەی بەکردەوە بیسلەمێنم منیش بەڕاستی خۆشمدەوێت.

ئەو شەوە من و ئەو سەبارەت بەعەشقەکەمان چەندین کاتژمێر گفتوگۆمان کرد. نزیک دوانزەی شەو بوو دوای بەسەر بردنی ڕۆژێکی دڵگیر و خۆش، هەرکام ڕۆشتینە سەر جێگەی خۆمان. ڕوئیا جێگەکانی لای یەک ڕاخستبوو. ساتێک دواتر لەناو تاریکی دڵبزوێنی شەو کەتیشکی مانگەشەو دەیڕازاندەوە، خزایە ناو باوەشم و وتی:

بەهمەنی ئازیزو و خۆشەویست، هیوای ژیانم، ئازیزەکەم...

بێ ئەوەی هیچ گوناحێک ئەنجام بدەین، وەک دوو هاورێی خۆشەویست شەومانکردە ڕۆژە.

## ٧

زەمان بەخێرایی تێدەپەڕی. من و ڕوئیا لەگەڵ یەک و لەو گوندە جوانە و دڵگیرە، باشترین قۆناغی ژیانمان بەسەر دەبرد.

ڕۆژەکان بۆ گەڕان و پیاسە و ئەسپ سواری ڕوومان دەکردە سارا و شەوانیش لەو ژوورە بچووکەی پیرێژنی دێهاتی دەحەواینەوە.

هەردووک لەو ڕۆژە خۆشانە چێژمان وەردەگرت، بەڵام لەبەر ئەوەی پارەکەم تەواو و لەلایەکی دیکە مامی ڕوئیا تا چەند ڕۆژێکی دیکە لەتاران دەگەڕایەوە، دوای چەند ڕۆژێک مانەوە لەو گوندە دڵگیرە، شەوێک بڕیارماندا بگەڕێینەوە بۆ شیراز و دوای گەڕانەوە بۆ شیراز، من ڕێگەی تاران بگرمەبەر بۆ ئەوەی بتوانم کارێک بۆ خۆم بدۆزمەوە و ڕوئیایش سەبارەت بەمن قسە لەگەڵ مامی بکات تا ئەویش بتوانێت ئەم بابەتە لەگەڵ باوکی بکاتەوە.

بەم بڕیارە، دوای ماڵئاوایی کردن لەماڵی پیرێژنی خانەخوێ و کوێخا و ئەو کەسانەی لەو چەند ڕۆژەدا ئاشنایان بووبووین، بەپاس بەرەو شیراز گەڕاینەوە. ڕوئیا گەڕایەوە بۆ ماڵی مامی و بڕیاردرا بەیانییەکەی یەکتر ببینین.

لەو دیدارەدا دووایین قسەکانمان سەبارەت بەژیانی داهاتوومانکرد و بڕیاردرا بگەڕێمەوە بۆ تاران بۆ ئەوەی کارێکی گونجاو بدۆزمەوە و دواتر خوازبێنی ڕوئیا بکەم.

کاتێک ویستمان جیاببینەوە، جارێکی دیکە ڕوئیا سوێندی خوارد جگە لەمن هیچ پیاوێکی دیکە لەژیانیدا دروست نابێت و چاوەڕێم دەمێنێتەوە و تەنیا مەرگ دەتوانێت لێکمان کاتەوە. لەکاتێکدا فرمێسک لەچاوەکانماندا قەتیس مابوو، جیابووینەوە و بڕیاردرا لەتاران یەکتر ببینینەوە.

بەدڵێک لێوانلێو لەعەشقی ڕوئیا و دنیایەک ئومێد و ئاوات، بۆ دەستپێکردنی ژیانێکی بەختەوەرانە بەیەکەم ترۆمبێلی شەوڕەو، ڕوومکردە تاران. دەمەونیوەڕۆ گەیشتم، سەرەتا ویستم بڕۆمە ماڵی حەمید بەڵام چوونکە پارەی قەرزار بووم بەباشم زانی تا دۆزینەوەی کارێکی گونجاو نەڕۆمە ماڵیان. دواتر ڕۆشتمە میوانخانەیەک و ژوورێکم بەکرێ گرت.

بەیانی ئەو ڕۆژە بۆ دۆزینەوەی کار ڕووم لەهەر شوێنێک کرد بەڵام بێ ئەنجام و نارەحەت بۆ میوانخانەکە گەڕامەوە.

چەند ڕۆژی بـەردەوام بێ وچان بەدوای کاردا دەگەڕام بەڵام هەمیشە وەڵامی نەرێنیم دەبیست.

شەوانە بەردەوام پروپاگەندەی ڕۆژنامەکانم بۆ دامەزراندن دەخوێندەوە و بەیانییان زوو پێش هەمووان دەڕۆشتمە ئەو شوێنانە بەڵام دوای سـەردان دەمبینی کەسانێتر بەپێشیار دۆستان و هاوڕێیان دامەزراون و چیتر پێویستیان بەکەسی تازە نییە.

لەبەر ئەوەی نەمتوانی کار بدۆزمەوە، بەناچاری ڕوومکردە ماڵی حەمید. بەبینینم شادوومان بوو و تەواوی بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە. کاتێک زانی بێکارم و پارەم نییە، ڕۆشتە لای باوکی و بەناوی خۆیەوە بڕێک پارەی لێوەرگرت و دای بەمن. پێشنیاریکرد لەبەرابەر کێشەکان خۆڕاگر بم تا ئەو کاتەی کارێک دەدۆزمەوە. سوپاسمکرد و ناونیشانی میوانخانەکەم پێدا و دواتر گەڕامەوە.

ماوەی یەک مانگی بەردەوام بەدوای کاردا دەگەڕام. لەم ماوەدا زۆرم هەوڵدا هەرچۆنێک بووە کارێکی ئابڕوومەندانە بدۆزمەوە و خوازبێنی ڕوئیا بکەم بەڵام سەرنەکەوتم.

ڕۆژێک بێ هیوا و ناڕەحەت لەمیوانخانەکە دانیشتبووم، کەحەمید هاتەسەردانم. ڕوئیا لەشیرازە نامەیەکی بەناونیشانی ئەو ناردبوو. حەمید نامەکەی پێدام و لەبەر ئەوەی کارێکی

گرنگی بوو، ڕۆشت و بەڵێنیدا دووبارە سەردانم بکات.

دوای ڕۆشتنی ئەو بەخێرایی نامەکەم کردەوە و سەرقاڵی خوێندنەوە بووم. بەڵام بەخوێندنەوەی هەر دێڕێک بەرچاوم تاریک و تاریکتر دەبوو. کاتێک نامەکەم خوێندەوە، بەسەرسوڕمانەوە بەخۆم وت: نا باوەڕ ناکەم ئەوەی خوێندمەوە ڕاست بێت، لەوانەیە ڕوئیایان بەنووسینی ئەم نامەیە ناچار کردبێت.

بەڵام نە، دەسخەتی ڕوئیا بوو. ڕوئیا کەسوێندی خواردبوو بۆ هەمیشە بەعەشقەکەمان وەفادار بێت، ڕوئیا کەبەردەوام باسی خۆشەویستی دەکرد، بۆ لەناکاو هەمووشتێکی فەرامۆشکرد و بەم نامەیە کۆتایی بەپەیوەندییەکەی نێوانمان هێنا.

نازانم، ئەگەری هەیە هۆکاری نووسینی ئەو نامەیە لەلایەن ڕوئیا، ئەوە بێت نەمتوانی بڕۆمە خوازبێنی. بەرهەحاڵ بۆ تێگەیشتنی ڕاستییەکان و بەمەبەستی ڕاوێژ کردن ڕووم لەماڵی حەمید کرد. نامەکەی ڕوئیام بۆ خوێندەوە و داوام لێکرد هاوکاریم بکات. ژمارە تەلەفۆنی ماڵی مامی ڕوئیام پێبوو، داوام لەحەمید کرد بەخوشکەکەی بڵێت و لەگەڵمان بێت بۆ ئەوەی پەیوەندی بەشیرازەوە بکەین و خوشکی حەمید ڕوئیا بێنێتە پشت تەلەفۆنەکە تا بتوانم قسەی لەگەڵ بکەم.

حەمید ڕازی بوو و خوشکەکەی ئاگادار کردەوە و دواتر هەرسێ هاتینەدەر. کاتێک زەنگی تەلەفۆنەکە لێدرا، کەسێک هەڵیگرت و بەخێرایی تەلەفۆنەکەم دا بەخوشکەکەی حەمید.

خوشکی حەمید داوای ڕوئیای کرد بەڵام ئەو کەسە وتی: ڕوئیا لەگەڵ دەزگیرانەکەی بۆ کڕینی کەلوپەلی بووکێنی ڕۆشتوونەتە بازاڕ. درەنگانێک دەگەڕێنەوە.

کاتێک ئەمەم بیست، فرمێسک لەچاوم کۆبوویەوە. نها باوەڕم کرد ڕوئیا خۆی ئەم نامەی نووسیوە. لەبەر ئەوە هەرچەند حەمید و خوشکەکەی زۆر داوایان کرد بڕۆمە ماڵی ئەوان، بەڵام ڕازی نەبووم و نیگەران و ناڕەحەت ماڵئاواییم لێکردن و بۆ میوانخانەکە گەڕامەوە. جارێکیتر نامەکەی ڕوئیام دەرهێنا وخوێندمەوە:

نووسیبووی:

بەهمەنی ئازیز

سڵاو، یەک مانگ بەسەر دوا دیدارمان تێپەڕی و تۆ بەپێچەوانەی بەڵێنەکەت، سەردانت نەکردم.

بەردەوام چاولەڕێی تۆ بووم بەڵام چاوەڕوانییەکەم نەهاتەدی. ئەم ماوە درێژە بەسە بۆ ئەوەی گۆڕانکاری لەژیانی هەرکەسێکدا ڕووبدات و بەسەرنجدان بەوەی تۆ لەژیانی من دەزانیت، لەم ماوەدا باوکم بێ ئیش دانەنیشتووە و

چەند بڕیارێکی سەبارەت بەژیانم گرتووە و بەداخەوە بەهۆی نەهاتنی تۆ و بەپێچەوانەی خواستی خۆم، ناچار بووم ڕازی ببم.

بەهەمەن ئەگەری هەیە ئەمە دوا نامەی من بێت، بەڵام داوا دەکەم لەجیاتی ئەوەی ڕق و کینەی من لەدڵ بگریت، بۆ ڕێزگرتن لەبیرەوەری عەشقەکەمان، بۆ هەمیشە هەڵیبگریت. بەهەرحاڵ، بڕیار بڕیاری خۆتە، ئەگەر نەتویست نامەکەم بدڕێنە، بیسووتێنە یا فڕێیبدە.

بەهمەنی ئازیز، ئێستا کەسەرقاڵی نووسینەوەی ئەم نامەم، نیوەشەوە، شەوێکی تاریک و ڕەش و مەترسیدار.

دەزانم لەم ماوەیە، لەبەر من هەوڵی زۆرتداوە و ئەگەری هەیە یەک شەویش بەئاسوودەیی سەرت نەنابێتەوە، بەڵام ئێستا کەئەم نامە دەنووسم هیوادارم چاوە جوانەکانی تۆ لەخەوێکی ئارامدا بێت.

چەندە خۆشمدەوێیت، ئەوەندەی تەنانەت گومان ناکەیت، زۆر حەز دەکەم جارێکی دیکە بتبینمەوە و بەچاوە جوانەکانت بڵێم چیتر نیگەرانی من مەبە، چوونکە ئەمشەو کەشەوی کۆتایی مانگە، چیتر هەموو شتێک کۆتایی هاتووە.

ئەمشەو لەهەموو شەوەکانی خوا، تاریکتر و ڕەشترە، ڕاستی ئەمشەو شەوی بیست و نۆیەمی مانگە و مانگیش

لەئاسمان تۆراوە و ڕۆشتووە.

بەڵام بەیانی، بەیانی کاتێک خۆر هەڵدێت و جارێکیتر خەڵک ژیانی ڕۆژانەیان دەستپێدەکەن، چیتر لێرە نیم.

ڕاستییەکەی ناتوانم چیتر لێرە بمێنمەوە.

ئێستا بەزۆر لەئەحمەد مارە بڕاوم و ئەم مارەبڕینە، وەک خۆت دەزانی بەپێچەوانەی خواستی منە. ئەحمەد بەهەر فێڵێک بۆتە هاوڕێی باوکم و تۆی بەهۆکاری بەدبەختی من ناساندووە و دواتر وەک خۆی دەڵێت بۆ ڕزگارکردنی من لەخراپەکاری و بەدبەختی، خوازبێنی کردووم.

باوکیشم کەپیاوێکی بێ ئەزموونە، بێ لێکۆڵینەوە بڕوای بەوتەکانی ئەحمەد کرد و بەزۆر منی لێ مارە کرد. بڕیارە بەم زووانە بەڕەسمی ببمە ژنی ئەحمەد.

بەهمەنی ئازیز، بەداخەوە دەبێت بڵێم چەند ڕۆژێکە بەهۆی ئەحمەدەوە دووبارە ئالوودەی مادەهۆشبەرەکان بوومەتەوە. ئێستا کچێکی خراپەکارم و بەدڵنیاییەوە شیاوی هاوسەری تۆ نیم چوونکە تۆ پیاوێکی پاک و بێگەردی و منی خراپەکار دەبێت لەگەڵ خراپەکارێکی وەک ئەحمەد ژیان بەسەر بەرم.

باوکم لەوەی دەبمە خێزانی ئەحمەد شادوومانە، چوونکە ئەحمەد کەسێکی دەستڕۆشتووە، پارەی هەیە، خاوەنی ڤێلا و ترۆمبێلە، باوکم گرنگی بەوە نادات ئەمانەی لەکوێوە هێناوە،

لەڕێگەی حەڵاڵ یا حەرام.

کێ کاری بەو شتانەیە، هەمووان گرنگی بەڕوخسار و ڕووکەشی مرۆڤەکان دەدەن بەهەمانشێوە کەباوکم گرنگی بەڕوواڵەتی ئەحمەد دەدات، لەکاتێکدا نەزانراو بەم کارەی من دەکاتە قوربانی.

باوکم لەم پەیوەندییە زیاد لەڕادە شادوومانە و بەردەوام باسی کەسایەتی، دەسەڵات، ترۆمبێل و پارەی ئەحمەد دەکات. تەنیا گرنگی بەو شتانە دەدات لەکاتێکدا نازانێت ئەحمەد چەند کەسێکی پەست و بێ ویژدانە و هەوڵەکان بۆ ئەوەی کەسایەتی باوکم بەئەحمەد بناسێنم، بێ ئەنجام بوو، ناڵەکانم کاریگەری لەسەر دڵی باوکم دانەنا و بۆ هاوسەرگیری من لەگەڵ ئەحمەد پێداگری دەکات.

لەوانەیە زۆربەی دایک و باوکەکان بەوشێوەیە بن. ئەوان گومان دەکەن پارە دەبێتە هۆی بەختەوەری. بۆ ئەو دایک و باوکانە گرنگ نییە ئەم پارە چۆن و لەکوێوە بەدەستهاتووە، ئەوان تەنانەت کچە گەنجەکانیان لەبەری پارە بەپیرەپیاوە دەوڵەمەندەکان دەفرۆشن و گرنگی نادەن بەوەی داهاتووی کچەکەیان بەکوێ دەگات.

منیش یەکێکم لەو هەزاران قوربانییەی بیرکردنەوەی ئەم جۆرە دایک و باوکانە.

ئەحمەد هەڕەشەی کردووە کەهەرچی زووتر ئەم شارە بەجێدێڵین. ئەو چوونکە لەپەیوەندی من و تۆ ئاگادارە، بۆ ئـەوەی گرفتـاری ئـاژاوە نەبێت، دەیـەوێـت بمباتە یەکێک لەشارەکان و لەوێ بەزم و ڕەزمی حەفلە ئامادە بکات.

بەهمەن داوات لێدەکـەم بـۆ ئـەم بابەتە ناخۆشە هیچ پەرچەکردارێک نیشان نەدەیت چوونکە من بەکەڵکی تۆ نایەم و بەسەرنجدان بەوەی دووبارە ئالوودی هێرۆئین بوومەتەوە، چیتر ناتوانی من لەو بەدبەختییە ڕزگار بکەیت. ئەحمەد بۆ ئـەوەی هەمیشە لەگەڵیدا بم، دووبـارە تووشی کردمەوە و داوات لێدەکەم بەگەورەیی و ڕێزداری خۆت فەرامۆشم بکەیت.

بەیانی من لەگەڵ ئەحمەد شاری بیرەوەرییەکانم بەجێدێڵم بەڵام بەبێ دڵم.

کچ تەنیا یەک دڵی هەیە و ئەگەر بەکەسێکی بدات هەرگیز ئەم دڵە نابێتە هی کەسیتر.

دڵی منیش بەوشێوەیە.

بەهمەنی ئازیز، عەشق و هیواکەم:

داوات لێدەکەم لەبری ئەوەی ناڕەحەت بیت و فرمێسک بڕێژیت و خەم لەدڵتا هێلانە بکات، تەنیا بیر لەبەخشینی من بکەیتەوە و بۆ ئەو گوناحە گەورەیە بمبووریت.

بـەڵام ئـەوە تەنیا داواکـاری من نییە و داواکارییـەکی

گەورەتریشم هەیە و هیوادارم بۆ ڕێزگرتن لەعەشقەکەمان ئەو خواستەیشم بێنیتەدی و بەقسەی منی گوناحکار کە لەگوناحی خۆمدا سووتام و لەوانەیە مردبێتم، ڕازی ببیت.

خۆشەویستەکەم، کاتێک ئەم نامەت بەدەست دەگات کەچیتر لای تۆ نیم و بەدڵنیاییەوە نەفرەت و نەحلەتم بۆ دەنێریت و باسی بێوەفاییم دەکەیت و ئەگەری هەیە فرمێسک بباریێنیت.

بەڵام ئازیزەکەم، نابێت بگریت، پێبکەنە، ئەوەندەی هەموو خەمەکانی دڵ فەرامۆش ببن. دواتر بەڵێن بدە ئەگەر کچێکی دیکە سەرنجی ڕاکێشایت، خۆشت بوێت، ئەوەندەت خۆش بوێت بتوانی من لەبیر بکەیت.

ئەمە داوای کچێکە کەتا کۆتایی تەمەن تۆی خۆشدەوێت.

بەهمەن، کاتێک هەستم بەعەشقە گەورەکەی تۆکرد کەدڵم مردبوو و خۆیشم لەناو خراپەکاریدا ڕۆچووبووم. تازە ئەو کاتەبوو هەستم بەڕاستی بابەتێک کرد و سەرمسوڕما. ڕاستییەک کەتۆ لەمنت شاردەوە و کاتێک پێمزانی، وشک بووم، لەگەڵ ئەوەیشدا فرمێسک لەچاوەکانم دەباری، چوونکە تەنیا چاوەڕوانی ئەوە لەتۆ دەکرا.

نازانم بەچ زمانێک سوپاسی تۆ بکەم، لەتۆ کەبۆ ڕزگارکردنی من یەکساڵی تەمەنت لەزینداندا بەسەر برد و تۆمەتی دزیت خستە پاڵ خۆت بەڵام ئامادە نەبووی ئابڕووی من بڕوات،

نازانم چۆن دەتوانم ئەم کارە گەورەی تۆ قەرەبوو بکەمەوە.

ناتوانم هیچ کارێک بکەم جگە لەوەی بۆ ئەو هەستە مەزن و خۆشەویستە، دەسخۆشیت لێبکەم و ئێستا کەخۆت دووریت، لەبەرابەر وێنەکەت کوڕنوش ببەم و فرمێسک ببارێنم.

تۆ هەموو شتێک، تەنانەت بنەماڵەکەت، کارەکەت، ئابڕووت خستەژێر پێ و بەتەواوی تۆمەت و بوختانەکان ڕازی بوویت تا من ڕزگار بکەیت، لەبەرابەر ئەم کارە گەورەی تۆ، دەتوانم چی بکەم، هیچ، هیچ.

چیتر نامەوێت لەمەزیاتر بەبیرهێنانەوەی بیرەوەرییەکان نارەحەتت بکەم.

ڕاستییەکەی لەئێستادا زمانم لاڵ، دڵم مردوو و ڕۆحم شکاوە.

چاوەکانم نووسراوەکانی سەر کاغەزەکە نابینێت و دەستم توانای ڕاگرتنی پێنووسەکەی نییە، فرمێسک ڕێگە نادات ئەوەی لەدڵمایە بینووسم.

خوایە گیان، چیتر هەست بەلێدانی دڵم ناکەم، خوێنم مەییوە و جەستەم ساردبۆتەوە.

ماڵئاوایی لەچاوە جوانەکانت دەکەم، فرمێسک دەبارێنم و دووبارە هیوادارم بمبەخشیت. داوای لێبوردنت لێدەکەم!

هیوادارم لەعەشق و ژیانی داهاتووت بەختەوەر بیت!

ئـەوەنـدەی فـەرامـۆش بکەیت کچێک بەناوی ڕوئیا ڕۆژێک لەڕۆژان لەژیانتا بووە.

بەمشێوەیە بۆ هـەمیشە ماڵئاواییت لێدەکەم و هیوادارم سەرکەوتوو بیت.

کەسێک کـەتـا کـۆتـایـی تـەمـەن لـەبـیـرت نـاکـات و تۆی خۆشدەوێت، ڕوئیا.

دوای خوێندنەوەی دووبـارەی نامەکەی ڕوئیا ئەوەندەی نەمابوو شێت ببم، بـەڵام تەنیا بەگریان بەسەندەم کـرد و لەبەر ئەوەی زۆر نارەحەت بووم، لەمیوانخانەکە هاتمەدەر و ڕۆشتمە دووکانێکی عەرەقفرۆشی ڕووبەڕووی میوانخانەکە. بڕێکی زۆر مەشروبم خواردەوە و دواتر بێ مەبەست بەناو کۆڵانەکاندا دەسووڕامەوە.

ئەمە سەرەتای ئاوارەیی و بەدبەختیم بوو. ڕەنگ بەژیانمەوە نەما، بیرم لەدەستخستنی کارێکی گونجاو نەدەکردەوە و لەبەر ئەوەی پارەم بەهیچ دەزانی، بۆ دابینکردنی پارەی مەشروب، هەرکارێکم دەکرد، تەنانەت ترۆمبێلەکانم دەشۆرد بۆ ئەوەی پارەم دەستکەوێت.

بەو پارەی لەم ڕێگایانەوە بەدەستم دەهێنا، هەموو شەوێک دەمخواردەوە و بەناو کۆڵانەکاندا دەسووڕامەوە. بڕیارمدابوو خۆم لەناو ببەم و مەشروب خواردن و گوێنەدان بەژیان بۆ

ئەو مەبەستە هاوکارییان دەکردم.

شەو و ڕۆژ بۆ لەبیرکردنی ئەو خەمە گەورەم، ئەوەندەم مەشروب دەخواردەوە گێژ و مەست دەبووم و بۆ ماوەیەک بەزۆری کحول هەموو شتێکم لەبیر دەکرد.

ئەگەر مەستی نەدەبوو، نەمدەزانی چۆن لەدەست ئەم خەم و خەفەتە هەڵبێم، ئەگەر مەیخانەیەک نەدەبوو، لەوانە تا ئێستا حەوت کفنم دڕاندبوو‌بێت.

تەنیا لەئامێزی مەیخانەکاندا بوو بۆ چەند ساتێک خەمەکانم لەبیر دەکرد. زۆربەی شەوان ئەوەندەم دەخواردەوە، نەمدەتوانی بەڕێگەدا بڕۆم و بەڕەتڵ بردن لەمەیخانەکە دەهاتمەدەر ودەخزامە سووچێک و تا بەیانی لەوێدا دەخەوتم.

ئەوەندە بەتۆمەتی مەستی بێ ئازار منیان بردبووە بنکەکانی پۆلیس و نەخۆشخانە کەچیتر هەموویان دەیانناسیم و کاتێک دەیانبینی لەسووچێکدا کەوتووم، کاریان پێم نەبوو.

ئێستا ئەلکولییەک تەواو بووم، ئەلکولییەکی تەواو سەرخۆش کەبیرم دەکردەوە ئەگەر عارەق نەخۆم، دەمرم.

کاتێک عارەقم پێنەدەگەیشت، جەستەم کۆڵنجی دەکرد، دەست و پێم دەلەرزی، زمانم وشک دەبوو و هەرسات چاوەڕوانی مەرگم دەکرد.

هەر ڕۆژ زیاتر لەڕۆژی پێشوو عارەقم دەخواردەوە.

ئەوەندە زێدەڕۆییم کرد خەڵک بەزەییان پیامدا دەهاتەوە و بەردەوام ئامۆژگاریان دەکردم بۆ ئەوەی دەست لەم کارەم هەڵبگرم.

دەیانوت ئەگەر بەمشێوەیە لەمەشروب خواردن بەردەوام بیت، لەسووچی یەکێک لەمەیخانەکان بەشێوەیەکی خراپ دەمریت. بەڵام من کەمەرگ ئەوپەڕی ئاواتم بوو، لەمەشروب خواردن بەردەوام بووم، لەمردن نەدەترسام بەڵام بەداخەوە، مەرگ خۆی لێدەشاردمەوە.

قوماربازێک بووم لەگەمە لەگەڵ ژیان هەموو شتێکم دۆڕاندبوو جگە لەغرورم.

بەڕاستی مەشروب شتێکی باشە بۆ دەردەداران، یا لانیکەم بۆ من. هەندێ شەو ئەوەندەم دەخواردەوە بێهۆش دەکەوتم. ئەوەندەم عارەق دەخواردەوە، جەرگم دەسووتا و توانای کۆنترۆڵکردنی خۆم نەدەما.

شەوێک کاتێک وەک هەمیشە ڕۆشتمە ناو مەیخانەیەکی بچووک و قەرەباڵغ، بڕیارمدا زیاتر لەهەموو شەوانیتر بخۆمەوە. بەردەوام داوای مەشروبم دەکرد، خاوەن مەیخانەکە چەند دەستە مشتەری بەڕێکرد بەڵام من لەپشت مێزەکەم دانیشتبووم و بەردەوام دەمخواردەوە. زیاد لەڕادەم خواردەوە و کۆتایی شەو نەمتوانی لەشوێنەکەم هەستم و لەو

شوێنەدا کەوتمە سەرزەوی و لەهۆش خۆم چووم.

وەک دواتر خاوەن مەیخانەکە دەگێڕێتەوە، ئەو شەوە ئەوەندە حاڵم خراپ دەبێت بەناچاری دوکتۆر بانگ دەکات و دوای پشکنینی سەرەتای فەرمان دەدات بەخێرایی بۆ نەخۆشخانە بمگوازنەوە.

خاوەن مەیخانە بەخێرایی پۆلیس لەم ڕووداوە ئاگادار دەکاتەوە و ئەوان بەترۆمبێلی فریاکەوتن بۆ نەخۆشخانەم دەبەن.

ماوەی بیست کاتژمێر لەسەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانە بێهۆش بووم و کاتێک هاتمەهۆش و چاوەکانم کردەوە، بەسەرسوڕمانەوە ڕوئیام بینی لەسەر سەرم وەستاوە.

خوایەگیان! ئایا هەڵەم نەدەکرد و ئایا ئەمە ڕوئیای ئازیزم بوو کەجلوبەرگی پەرستاری پۆشیبوو و بۆ هاوکاریکردنی من لەسەرسەرم وەستابوو؟

بەهەرحاڵ بەتەواوی خۆشحاڵ بووم.

نازانم چۆن وەسفی ئەو کاتەی خۆم بکەم بەڵام شادوومانی لەڕوخسارم دەباری.

دەمویست لەتەختەکەم بێمەخوار و ڕوئیا لەئامێز بگرم، سوپاسی بکەم کەجارێکی دیکە هاتۆتەلام. دەمویست هاوار بکەم و پێی بڵێم هێشتا خۆشمدەوێت و لەبەر ئەو کەوتوومەتە

ئەم بارودۆخە.

بەڵام بەداخەوە توانام نەبوو. نەمدەتوانی یەک وشە بێنمە سەرزمان. ماوەیەک حەپەساو سەیرم کرد، چاوم لێهەڵنەگرت و ئەویش ئارام و بێدەنگ لەسەر سەرم وەستابوو و سەیری دەکردم. بەڵام ڕوانینەکەی بەتەواوی بێگانە بوو.

کەمێک جووڵام، دانەوی، دەستی خستەسەر سینەم و بەئارامی وتی:

تکایە مەجووڵێ.

خوایەگیان! ئەمە دەنگی ڕوئیا نەبوو، ئەمە ڕوئیا نییە؟

ئەمە عەشق و هیوای من نییە؟ نە، ئەو پەرستاری نەخۆشخانە بوو و زیاد لەڕادە لەڕوئیا دەچوو وەک بڵێی دوانەن.

سەرسوڕماو سەیرم دەکرد و ئەویش ئارام و بێدەنگ سەیری دەکردم. لەم کاتەدا پەرەستارێک هاتەژوور و پێی وت:

شەهلا گیان، دەزگیرانەکەت هاتووە و کاری پێتە، من لێرە دەمێنمەوە تا دەگەڕێیتەوە.

بەدوای ئەم قسەیە، ئەو پەرەستارەی زیاد لەڕادە لەڕوئیا دەچوو و زانیم ناوی شەهلایە، لەژوورەکە ڕۆشتەدەر.

دوای ڕۆشتنی ئەو، من کەتا ڕادەیەک باش بووبوومەوە،

سەبارەت بەشەهلا لەو پەرەستارەی دیکە پرسیارم کرد.

وتی:

ڕاستییەکەی شەهلا تازە لەم نەخۆشخانەیە دامەزراوە و زۆر تێکەڵ نین و زانیاری کەمم لەسەر ئەو هەیە.

سەبارەت بەدەزگیرانەکەی شەهلا پرسیارم کرد، وتی:

لەمبارەیشەوە زۆر نازانم بەڵام ئەو پیاوەی شەهلا دەڵێت دەزگیرانییەتی، کەمانچەژەنێکی بەناوبانگە و هەندێکات لەگەڵ شەهلا کەدەنگی خۆشە، ڕاهێنان دەکات. شەهلا بەیەکێک لەپەرەستارەکانی وتووە دوو مانگ پێش لەمیوانییەکدا لەگەڵ ئەم کەمانچەژەنە ئاشنا بووە و لەبەر ئەوە ئەو پیاوە دەنگی شەهلای پێخۆش بووە، پێشنیاری کارکردنی پێداوە و بەهۆی هاتوچۆی بەردەوام، سەرئەنجام مارەی کردووە. ئەو ڕۆژانەی شەهلا لێرەیە، دێتە نەخۆشخانە و پێکەوە دەڕۆنەوە.

بۆ ئەوەی پەرەستارەکە گومان نەکات، هیچیترم نەپرسی. زانیارییەکانم سەبارەت بەشەهلا ئەوە بوو، بەڵام دەمزانی بەتەواوی هاوشێوەی ونبووەکەی خۆمە، ئەگەری هەیە ئەگەر دەنگی لەدەنگی ڕوئیا دەچوو، هەرگیز نەمدەتوانی بزانم ئەوە ڕوئیایە یا نە.

لەکاتێکدا نوقمی ئەم بیرکردنەوە بووم، دوکتۆر هاتەژوور و لەحاڵی پرسیم و دوای پشکنینێکی کورت، پیرۆزبایی

لێکردم بۆ ئەوەی لەمەرگ ڕزگارم بووە و ژیانێکی تازەم پێبڕاوە. لەبەر ئەوەی شەهلا لەم کاتەدا گەڕایەوە، دوکتۆر و پەرەستارەکەی دیکە ژوورەکەیان بەجێهێشت.

دوای ڕۆشتنی ئەوان، کاتێک بەتەنیا ماینەوە، دەمویست قسەی لەگەڵ بکەم، بەڵام نەمدەتوانی.

جێگەکەی ڕێککردم و دوای ئەوەی پرسی هیچم پێویستە یا نە، ماڵئاوایی کرد و ڕۆشت و داوای کرد ئەگەر کارێکم بوو، زەنگ لێبدەم.

دوای ڕۆشتنی شەهلا، بێزارییەکی سەیر لەو، سەراسەری ناخی داگیرکردم. بیرهێنانەوەی بیرەوەری شەهلا و هاوشێوەیی ئەو لەگەڵ ڕۆئیا بووە هۆی دروستبوونی ئەم بێزارییە. لەو ساتە قەیرانییەدا بەڕادەیەک لێی بێزار بووم چیتر نەمدەویست بیبینم.

لەبەر ئەوە کاتێک دوکتۆر هاتەژوورەکەم بۆ ئەوەی پشکنینم بۆ بکات، بەسەرهاتی ژیانم بۆ باسکرد و داوامکرد شەهلا بۆ پەرەستای من نەنێرێت و لەجیاتی ئەو پەرەستارێکی دیکە بۆ ژوورەکەم دیاریبکات.

دوکتۆر ڕازی بوو و پەرەستارێکی دیکەی نارد کە بەپێچەوانەی شەهلا زۆر ناشیرین بوو. ئەم پەرەستارە ناشیرینە، لەگەڵ ئەوەیشدا خەمبار و توڕە بەرچاو دەکەوت،

بەڵام هەرچی بوو لەشەهلا باشتر بوو. بەدڵسۆزییەوە پەرەستاری دەکردم، نازانم دوکتۆرەکە چی پێ وتبوو تا ئەو رادەیەک میهرەبان هەڵسوکەوتی دەکرد و هەندێ کات چەندین کاتژمێر لای تەختەکەم دادەنیشت و قسەی دەکرد. زۆر حەزم دەکرد هۆکاری خەمی ڕوخساری ئەو پەرەستارە بزانم تا ئەوەی ڕۆژێک لەکاتی گفتوگۆ تێگەیشتم کە لەناشیرینی ڕوخساری ڕەنج دەبات و خەمی گەورەی ئەوەیە و لەبەر ئەوەیە زیاد لەڕادە وەک کەسێکی لەخۆبایی بەرچاو دەکەوێت. لەبەر ئەوەی ناشیرینە، ئامادە نییە هیچ پیاوێک بەبەزەییەوە ئەوی خۆش بوێت و ئەمە هۆکاری سەرەکی نارەحەتی ئەوە.

خەمبار بووم و بەخۆم وت: سروشت چی ناکات، ژنێک بەڕادەیەک جوان دەئافرێنێت دەبێتە وێردی سەر زمانی هەمووان و کەسێک ئەوەندە ناشیرین دروست دەکات، کەس ئامادە نییە لێی نزیک ببێتەوە و تەنانەت خۆیشی لەڕوخساری خۆی هەڵدێت.

کاتێک زانیم ئەو پەرەستارە پێی خۆش نییە زۆر لەمبارەوە پرسیاری لێبکەم، چیتر هیچم نەپرسی و بابەتەکەم گۆڕی.

ڕۆژی دواتر، دوای تەواوبوونی کاتژمێری کارکردن، کاتێک دەیویست لەژوورەکەم بڕواتەدەر، ڕوویکردە من و وتی: ڕاستی بەیانی بڕیارە بۆ بەهێزکردنەوەی ورە و

ڕۆحییەی نەخۆشەکان ئاهەنگێک لەحەوشی نەخۆشخانەکە بەبەشداری چەند هونەرمەندێک ساز بکرێت، ئێوەش ئەگەر حاڵتان باشبووە دەتوانن بەشداری لەم ئاهەنگە بکەن.

بەڵێنمدا و ڕۆژی دواتر منیش لەگەڵ نەخۆشەکانی دیکە کەتا ڕادەیەک حاڵیان باش بووبوویەوە، ڕۆشتینە شوێنی ئاهەنگەکە.

لەم کاتەدا چەند گۆرانبێژ و ژەنیاری بەناوبانگ چەند بەرنامەیەکیان بۆ نەخۆشەکان پێشکەشکرد و ڕووبەڕووی پێشوازی گەرمی نەخۆشەکان بوویەوە.

کتاوپڕ پێشکەشکار ڕایگەیاند نها شەهلا، پەرەستاری نەخۆشخانە کەدەنگە دڵنشینەکەی بۆ هەمووان ئاشنایە، هاورێ لەگەڵ دەزگیرانەکەی کەکەمانچەژەنێکی بەناوبانگە، ئاهەنگێکی سەرنجڕاکێشتان پێشکەش دەکات.

شەهلا لەناو چەپڵەی ئامادەبووان، لەگەڵ کەمانچەژەنەکەی دەزگیرانی، هاتەسەر شانۆ و گۆرانی خوێند.

دەنگی ناسک و دڵنشینی شەهلا، نەشیاو بۆ وەسف کردن بوو. تا ئەو ڕۆژە زۆر وەسفی دەنگی ئەویان بۆ کردبووم بەڵام هەرگیز گومانم نەدەکرد دەنگی تا ئەو ڕادەیە دڵنشین بێت.

بەڕادەیەک بەهەست و سۆزەوە دەیخوێند، ڕەقترین دڵی دەکردە ئاو.

کاتێک یەکەم گۆرانی تەواو بوو، ئامادەبووان بۆ ماوەی چەند خولەکێک چەپڵەبارانیان کرد و بەهۆی چەپڵە و داواکاری بەردەوامی ئامادەبووان، چەند گۆرانییەکی دیکەی پێشکەش کرد. لەکاتێکدا بەردەوام داوای دووبارە کردنەوەیان لێدەکرد، بەهۆی نەبوونی کات داوای لێبوردنی کرد و لەشانۆکە هاتەخوار.

کاتێک ئاهەنگەکە تەواو بوو، لەکاتێکدا بۆ کردەوەی نەشیاوم بەرابەر بەشەهلا، پەشیمان بوومەوە، خەمبار و بیرمەند بۆ ژوورەکەم گەڕامەوە.

دەنگی شەهلا کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر دانام، ئاوازی ئەو، لەقووڵایی دڵییەوە سەرچاوەی دەگرت و بەشێوەیەکی دڵنشین لەقورگی دەهاتەدەر.

دەنگی بەڕادەیەک گەرم و سەرنجڕاکێش بوو، خۆم بەشەیدای دەنگی دەزانی.

هەندێکات ئەگەری هەیە، چەند شتێک کاریگەری لەسەر ژیانی مرۆڤ دابنێت بەشێوەیەک بۆچوونی کەسێک سەبارەت بەشتێک بەتەواوی بگۆڕێت. سەبارەت بەشەهلایش بەو شێوە بووم و بۆچوونم سەبارەت بەو بەتەواوی گۆڕا.

سەرمسوڕمابوو ئەو بەم دەنگە دڵگیرە بۆ پیشەی گۆرانیبێژی هەڵنەبژاردووە، لەوانەیە هۆکارێکی بێت کەمن لێی بێ ئاگام.

لەو ڕۆژە بەدواوە چیتر لەشەهلا ڕامنەدەکرد بەڵکو حەزم دەکرد قسەی لەگەڵ بکەم، بەلاّم ئەو هەرکات دەرفەتێک دەهاتەپێش و ڕووبـــەڕووی یەکدەبووینەوە، بەخێرایی هەڵدەهات و هەوڵی دەدا ڕووبەڕووم نەبێتەوە.

لەگەڵ ئەوەی چەندین جار پەیامم نارد. و بۆ ئەو هەڵە تێگەیشتنە داوای بەخشینم کرد بەلاّم ئەو بەهەمانشێوە سارد و وشک هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردم. ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو تا ئەوەی ڕۆژێک دوکتۆر بۆ پشکنین هاتەژوورەکەم و دوای پشکنینێکی گشتی وتی:

خۆشحاڵم لەوەی ئاگادارتان بکەمەوە، حاڵتان بەتەواوی باش بووە و دەتوانن نەخۆشخانە بەجێبێڵن.

لەکاتێکدا لەکردەوەی شەهلا بەتەواوی نارەحەت بووبووم، ڕۆشتمە لای پەرەستارەکانی دیکە و دوای سوپاسکردنیان، لەهۆڵی نەخۆشخانە هاتمەدەر. ئەو کاتەی بەمەبەستی ماڵئاوایی لەگەڵ پاسەوانەکانی نەخۆشخانە لەبەردەم دەرگای چوونەدەرەوە وەستابووم، یەکێک لەپەرەستارەکان بەڕاکردن هات و نامەیەکی بچووکی پێدام و وتی شەهلا ناردوویەتی. دوای ماڵئاوایی لەپاسەوان و ئەو پەرەستارە، لەدەرگای نەخۆشخانە هاتمەدەر.

هەوای دەرەوەی نەخۆشخانە ڕۆحێکی تازەی پێبەخشیم،

هەستمکرد ژیان لەڕەوتی ئاسایی خۆی دەڕواتە پێش و هەرکەسێک سەرقاڵی کاری خۆیەتی.

چەرخی سروشت دەسووڕا و چارەنووسی مرۆڤەکانی دیاریدەکرد.

ئەو مرۆڤانەی زۆربەیان شارەزای ڕاستییە تاڵەکانی ژیان نەبوون و لەهەوڵی ئەحمەقانەنی خۆیان بۆ ژیان بەردەوام بوون.

منیش دوای ماوەیەکی زۆر کەوتن لەسەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانە، دووبارە گەڕامەوە بۆ ناو مرۆڤەکان، ئەو مرۆڤانەی لای یەک دەژین، خیانەت لەیەک دەکەن، چاکە دەکەن، تۆڵە لەیەک دەستێنن و بەکورتی بۆ گەیشتن بەمەبەستەکانیان و تەنیا بۆ زیندوو مانەوە، نەک ژیانکردن، ژمارەیەکی زۆریان کەتەنیا ناوی مرۆڤیان پێبڕاوە، هەرکارێک دەکەن.

دوای چەند مانگ دووری لەکۆمەڵگای ئەم مرۆڤە چاک و خراپانە، گەڕامەوە بۆ ناویان، لەکاتێکدا چارەنووس لەگەمەکانی بەردەوام بوو.

## ٨

ئەو شەوە دووبارە گەڕامەوە بۆ ئەو میوانخانەی پێشتر لێی نیشتەجێبووم. ژوورەکەیان دابووم بەکرێ و خاوەن میوانخانە ژوورێکی دیکەی پێدام. ماوەیەک بەناو ژوورەکەدا گەڕام و دواتر لەسەر تەختەکە دانیشتم و نوقمی دەریای ئەندێشە بووم.

ژیانی ڕابردووم کەوتەوە بەرچاو، ماوەیەک بێ ئیرادە گریام، دەمویست بەمشێوەیە قورسایی ئەو خەمە گەورەی سەرشانم نەمێنێت.

بەڵام بەداخەوە فرمێسکیش نەیتوانی ئارامم بکاتەوە، دەماری خەم بەشێوەیەک لەناو دڵما ڕەگی داکوتابوو، نەیدەهێشت بۆ یەک ساتیش ئارام بم. لەم کاتەدا بوو لەناکاو بیری نامەکەی شەهلا کەوتمەوە. دەرمهێنا و خوێندمەوە.

ئەو زۆر بەکورتی نووسیبووی:

دوێنێکە پەیوەندییەکانم لەگەڵ ئەو پیاوە کۆتایی هات، ئەگەر دەتەوێت بمبینی ئەوە ناونیشانەکەمە.

دوو سێ جار کاغەزەکەم ئەمدیواودیو کرد بەڵام هیچی تیا نەنووسرابوو، لەکاتێکدا لەبڕیار گۆڕینەکەی سەرمسوڕمابوو، نامەکەم نووشتانەوە و خستمە گیرفانم بۆ ئەوەی لەدەرفەتێکی گونجاودا سەردانی بکەم.

لەو ساتەدا بیری تێکەڵ و پێکەڵ هێرشیاندەکردە سەر مێشکم، هەمانسات بیرم دەکردەوە بڕۆمە ماڵی شەهلا و بۆ ڕزگارکردنی خۆم لەو بەدبەختی و ئاوارەییە داوای لێبکەم شووم پێبکات.

بەڵام زوو پەشیمان بوومەوە و هەستی بێزاری سەراسەری جەستەمی داگرت. لەوەی تا ئەو ئەندازەیە هاوشێوەی ڕوئیا بوو، ڕەنجم دەبرد، جیاواز لەوە لەهەڵسوکەوتی لەو ماوەی لەنەخۆشخانە خەوێنرابووم، بێزار بووم، لەبەر ئەوە نەڕۆشتمە ماڵەکەی و بۆ کاتێکی دیکە دوامخست.

بەدەم بیرکردنەوەی پەرێشان و ئاڵۆز لەسەر جێگەکەم کەوتم. جگەرەیەکم داگیرساند و لەبەر ئەوەی تەواوی ڕۆژ بەپێ ڕێمکردبوو، چەند سات دواتر لەبەر هیلاکی خەوم لێکەوت.

بەیانی ڕۆژی دواتر، درەنگتر لەو کاتەی لەنەخۆشخانە هەڵدەستام، لەخەو هەستام و دوای شۆردنی دەست و دەم و چاوم بەسابوون، بەمەبەستی نانخواردنی بەیانی لەمیوانخانەکە

هاتمەدەر و بڕیارمدا سەرێک لەشەقامە قەرەباڵغەکانی شار بدەم بۆ ئەوەی پیاسەیەکم کردبێت. سەرەتا ڕۆشتمە شەقامی نادری و دوای تێپەڕین لەشەقامی ئیسلامبۆڵ، چوومە سەر شەقامی لالەزار. لەڕیزی درێژی ترۆمبێلەکان کە بەهێواشی دەڕۆشتن، قەرەباڵغی خەڵکان لەبەردەم دووکانەکان و قەرەباڵغی شۆستەکان و هاتوهاواری دەستگێڕەکان چێژم دەبرد.

ماوەیەک بەناو قەرەباڵغییەکەدا سووڕامەوە و سەرئەنجام بڕیارمدا بۆ کات بەسەر بردن بڕۆمە سینەما. لەبەردەم شوێنی بیتاقە فرۆشتنی سینەما لەشەقامی لالەزار وەستام، لەبەر ئەوەی بۆ دەستپێکردنی فیلمەکە زۆری مابوو و بیتاقەیان نەدەفرۆشت، بەسەیر کردنی وێنەکان خۆم سەرقاڵکرد، دواتر ڕۆشتمە دووکانێکی شەربەت بۆ ئەوەی ئاو میوەیەک بخۆمەوە و کات بەسەر ببەم بەڵام هێشتا ئاومیوەکەم نەخواردبوویەوە کە لەناکاو دەستێک بەرشانم کەوت. کاتێک ئاوڕم دایەوە، حەمید و کچێکم لەڕووبەڕووی خۆم بینی. یەکترمان لەئامێز گرت و دواتر کچەکەی پێناساندم کەیەکێک لەخزمەکانی بوو.

بەبینینی حەمید شادوومان بووم. ڕاستییەکەی دوای هاتنەدەر لەنەخۆشخانە، لەبەر ئەوەی حاڵم باش نەبوو و بڕێکی زۆری قەرزار بووم، سەردانم نەکرد. کاتێک گلەیی کرد،

لەبەر ئەو کچەی لەگەڵی بوو هیچم نەوت و وتم تۆ ڕاست دەکەیت.

بەزۆر داوای کرد پێکەوە بین، ڕازی بووم و سوار تاکسی بووین. ئەو کچەی گەیاندە ماڵەوەیان و دوای ماڵئاوایی کردن لەو، حەمید بەردەوام گلەیی دەکرد کە بۆسەردانم نەکردووە. ڕۆشتینە شەقامی پەهلەوی.

لەسەر داوای حەمید ڕۆشتینە ڕیستۆرانتێک. داوای خواردنی کرد، تا هێنانی خواردنەکە، هەموو بەسەرهاتی خۆم بۆ حەمید گێڕایەوە.

دوای نانخواردن، ماوەیەک بێدەنگ بووین. دواتر حەمید لەکاتێکدا سەیری ڕوخساری دەکردم، بێ پێشەکی وتی:

بەهمەن، ڕاستی ئەو کاتەی لەنەخۆشخانە بوویت، ڕۆژنامەت دەخوێندەوە.

نا، زۆر کەم.

کەمێک وەستا و لەکاتێکدا بۆ وتنی قسەکەی دوودڵ بوو، وتی:

بەهمەن دەمەوێت شتێکت لێ بپرسم، ئایا ئێستایش وەک جاران ڕوئیات خۆشدەوێت.

بەڵێ، هەرچەند ئەو منی لەبیرکردووە، بەڵام من بەردەوام لەبیرمە.

دەمەوێت سەبارەت بەڕوئیا شتێکت پێ بڵێم کەدڵنیام لێی بێ ئاگایت، بەڵام بەڵێن بدە ناڕەحەت نەبیت.

گومانم کرد دەیەوێت سەبارەت بەهاوسەرگیری ئەحمەد و ڕوئیا قسە بکات، لەبەر ئەوە بەڵێنم پێدا ناڕەحەت نەبم.

دووبارە کەمێک وەستا. دەترسا لەوەی قسە بکات، بەڵام من کەبیرم لەهاوسەرگیری ڕوئیا و ئەحمەد دەکردەوە، دووبارە بەڵێنمدا ناڕەحەت نەبم و سوێندم بۆ خوارد.

باوەڕی نەدەکرد ئەو بەڵێنەم پێداوە و سەیری دەکردم، لەکاتێکدا دەیویست خوێنسارد بێت، ماوەیەک باسی مەرگ و ژیان و ئەوەی هەمووومان ڕۆژێک دەمرین و ئەو شتانەی کرد. کاتێک زانیم بەلاڕێدا دەڕوات، بەگومانی ئەوەی دەیەوێت باسی هاوسەرگیری ڕوئیا و ئەحمەد بکات، جارێکی دیکە بەڵێنم پێدا و سوێندم بۆ خوارد کە بەقسەکانی ناڕەحەت نابم و تکام لێکرد پێم بڵێت چی بووە و چی ڕوویداوە.

ئەم جارە دوودڵ وتی:

ماوەیەک پێش کاتێک لەماڵەوە سەرقاڵی خوێندنەوەی ڕۆژنامە بووم، لەناکاو چاوم بەوێنەی ڕوئیا و گەنجێک بەناوی ئەحمەد کەوت.

بەگاڵتەوە قسەکەیم بڕی و وتم:

بەدڵنیاییەوە نووسیبووی ئەم دووانە پەیوەندی

هاوسەرگیرییان بەستووە.

نە، نووسیبووی. بەناڕەحەتی یەوە وەستا.

وتم»

چی نووسیبوو؟

نووسیبووی:

ئەو دووانە بەهۆی کارەساتی ترۆمبێلەوە مردوون.

ناباوەڕانە و پەرێشان وتم:

کوژراون؟

یانی ڕوئیا مردووە؟

بەڵێ مرد، بەشانازییەوە مرد.

بەبیستنی ئەم هەواڵە کتاوپڕە، سەرتاپای گیانم کەوتە لەرزین. جەستەم بەئاشکرا دەلـەرزی و شەقەی ددانەکانم ڕۆژەڕێـیـەک دەڕۆشـت. دەمویست بەدەنگی بـەرز بگریم و بقیژێنم بەڵام فرمێسک لەچاوەکانم نەدەهاتەخوار.

بەدژواری لێوم جووڵاند و پرسیم:

ئاخر چۆن مرد؟

بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بم بەردەوام بووم، نا باوەڕ ناکەم. بەدەستەم ڕوخسارم داپۆشی، ڕوومکردە حەمید و بەدەنگی کز وتم: چەندە بەدبەخت و داماوم، ئای کەبەدبەخت و بێچارەم!

حەمید کاتێک پەرێشانی منی بینی، دڵنەوایی دەدامەوە و داوای لێکردم بۆ ئەوەی ڕیستۆرانتەکە نەشڵەقێت، خۆم کۆنترۆڵ بکەم. چوونکە سوێندم بۆ خواردبوو و بەڵێنم پێدابوو ناڕەحەت نەبم، بەهەر شێوەیەک بوو هەوڵمدا خۆم کۆنترۆڵ بکەم.

دواتر داوام لێکرد ڕووداوەکەم بەوردی بۆ بگێڕێتەوە و ئەو لەکاتێکدا سەری ڕادەوەشاند، وتی:

ماوەیەک لەمەوبەر سەرقاڵی هەڵدانەوەی پەڕەی ڕۆژنامەکان بووم و لەناکاو چاوم بەوێنەکەی ڕوئیا و ئەحمەد کەوت کە لەخوارەوەی نووسرابوو: دوو نامزەدی گەنج کە بۆ ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی بووکینی دەڕۆشتن، بەهۆی کارەساتی ترۆمبێل لەجادەی شیراز کوژراون.

بەشێوەیەک لەڕۆژنامەکەدا نووسرابوو و پەیامنێرانیش لەشیراز و ئیسفەهانەوە ڕاپۆرتیان لەسەردابوو، ترۆمبێلەکەیان لەکاتێکدا ڕوئیا لێیخوڕیوە، بەهۆکارێکی نادیار لەناوەڕاستی جادەی شیراز-ئیسفەهان، دەکەوێتە ناو دۆڵەکە و بەهۆی ئەم ڕووداوەوە هەردووکیان دەکوژرێن.

پسپۆری بواری هاتوچۆ کاتێک سەردانی شوێنەکەی کردووە، ڕووداوەکەی بۆ خێرایی زۆر و کەمتەرخەمی لێخوڕەکە گەڕاندۆتەوە.

بەسەرنجدان بەهەواڵی ڕۆژنامەکە، ڕووداوەکـە بەهۆی ئەوەوە بوو کەترۆمبێلەکەی هەڵگری ئەحمەد و ڕوئیا بەهۆی خێرایی و کەمتەرخەمی لێخوڕەکە یانی ڕوئیا، دەکەوێتە دۆڵەکە و هەردووکیان دەستبەجێ دەکوژرێن، بەڵام نامەیەک کەسێ ڕۆژ دواتر، دوای بڵاوبوونەوەی ئەو هەواڵە بەدەستم گەیشت، باسی لەڕاستییەکی تاڵی دیکە دەکرد. دوای خوێندنەوەی نامەکە کەنووسەرەکەی کەس نەبوو جگە لەڕوئیا، تێگەیشتم ئەمە تەنیا ڕووداوێک نەبووە و ڕوئیا بەئەنقەست ئەو کارەی کردووە.

ڕوئیا پێش ڕۆشتن لەشیراز ئەو نامەی بۆ من نووسیبوو. کاتێک کردمەوە، بینیم نامەکە بۆ تۆ نووسراوە و لەبەر ئەوەی هەواڵی تۆم نەبوو، لای خۆم هەڵمگرت.

لەمکاتەدا حەمید لەجانتاکەی شانی نامەیەکی دەرهێنا و پێیدام. بەخێرایی نامەکەم کردەوە و خوێندمەوە: لەنامەکە دوای سلاو و هەواڵپرسی نووسرابوو:

بەهەمەنی ئازیز، ژیـان درەنـگ یـا زوو کۆتایی دێت و هەمووومان ڕۆژێـک دەمرین، دەستەیەک بەمناڵی دەمـرن و دەستەیەک لەتەمەنی گەنجی و دەستەیەک لەپیریدا، بەڵام بمانەوێت و نەمانەوێت دەبێت تەسلیمی مەرگ ببین.

هیچ ڕێگەیەکی هەڵاتن لەمەرگ نییە و دەبێت بزانین هەموو

شتێک لەم جیهانەدا تەواو دەبێت تەنانەت عەشقیش لەگەڵ هەموو شکۆ و مەزنییەک، ڕۆژێک کۆتایی دێت، بەڵام ئەوانەی عاشقی ڕاستەقینەن، بیرەوەرییەکی نەمر لـەدوای خۆیان بەجێدێڵن، حەز دەکەم عەشقەکەی ئێمەیش بەوشێوەیە بێت.

لەنامەکەی پێشوو بۆم نووسی لەگەڵ ئـەوەی داوام لێ کردی لەژیان بـەردەوام بیت، هەواڵی هاوسـەرگیری خۆم و ئەحمەدم پێدایت. بڕیارە بەزوویی بەرەو تاران بەڕێکەوین و چاومان بەچەند کـەس لەخزمەکان بکەوێت و دواتـر بۆ ئاهەنگەکەمان بڕۆینە یەکێک لەشارەکان.

تەنانەت بیرکردنەوە لەوەی شەوی بووکێنی بەجلوبەرگی سپی کەتایبەت بەفریشتەکانی ئاسمان، لای ئەحمەد بم، ئازارم دەدات، ئەگەری هەیە تا ئەمڕۆ گومانت کردبێت بەو پەڕی بێوەفایی، ئەحمەدم بۆ ژیان هەڵبژاردبێت بەڵام دڵنیابە ناهێڵم ئەحمەد بەئاواتەکەی بگات. بڕیارمداوە یا لەگەڵ تۆ بژیم یا بمرم، ئێستا کەناتوانم لەگەڵ تۆبم، مەرگم هەڵبژارد. بەڵام نازانم چۆن خۆم لەدەست ئەم ژیانە ڕزگار بکەم، بەڵام ئەو کارە دەکەم.

بەدڵنیاییەوە کاتێک ئەم نامەیە دەنێرم کەچەند کاتژمێر دوای ئەوە پلانەکەم جێبەجێ دەکەم و ئەم نامە کاتێک بەدەستی تۆ دەگات کەچیتر زیندوو نیم بەڵام وەک لەنامەکەی پێشوودا

بۆم نووسی، ڕازی نیم لەبەر من یەک دڵۆپ فرمێسک بڕێژێت و ئەگەر دەتەوێ لێت ڕازی بم، بەو عەشقە پاکەمان سوێندت دەدەم، ئەگەر کچێک سەرنجی ڕاکێشایت، بۆ زیندووکردنەوەی عەشقەکەمان، خۆشتبوێت دڵنیام بەوشێوەیە ڕۆحم ئاسوودە دەبێت.

بەهمەن، دڵنیام تۆ لەبەر ئاسوودەیی ڕۆحی منیش بێت ئەو کارە دەکەیت، بەڵام هیوادارم بڕیارێک نەدەیت ڕۆحم گرفتاری ئازار ببێت.

دەخوازم تۆ لەژیان بەردەوام بیت و بەهەمووان بسەلمێنیت لەگەڵ ئەوەی ناجوامێرانە پەڕوباڵیان بڕی، بەڵام هێشتا لەسەر پێی خۆت وەستاویت.

لەژیاندا زۆر شت ڕوودەدات کەمرۆڤ لەمافەکانی بێبەش دەکات. ئەم نادادپەروەرییە لەهەموو ڕەهەندەکانی ژیان دەبینرێت و جیبەجێکارانی کۆیلەکانی دەسەڵات و پێگە و پارەن.

بەڵام بەهمەنی ئازیز، دڵنیابە دادپەروەری خوایی هەمیشە لەسەروو هەموو یاساکانەوەیە و ئەوانەی بۆ دوو ڕۆژ ژیانی ئەم دنیا، هەموو شتێک و هەموو کەسێک دەکەنە قوربانی بەرژەوەندی کەسێتی خۆیان، دەبێت بزانن مەرگ ڕۆژێک، بەرۆکیان دەگرێت و ئەوان ناچارن، خوازراو و نەخوازراو،

ڕیسوایانە ماڵئاوایی لەژیان بکەن بەڵام بەدڵنیاییەوە، بیرەوەری کارە خراپ و نەشیاوەکانیان بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە. بنەماڵەکەم دوای مەرگم، بەڕازی بوون بەو ڕیسواییە ناچارن زیندووبن، لەڕاستیدا ئەوان بوون بەکارەکانیان منیان کردە قوربانی تا خۆم بەرەو پیری مەرگ بڕۆم و شانازی دەکەم سەربڵند و بێ ئەوەی ملکەچی بڕیارەکانی ئەوان بم، بەرەو مەرگ دەڕۆم و دەمرم.

زیاتر لەوە کاتت ناگرم و هیوام بەختەوەریتە. هێشتا نازانم چ کاتژمێرێک و چۆن پلانەکەم جێبەجێ دەکەم بەڵام دڵنیام ئەم نامە دوای مەرگم بەدەستی تۆ دەگات.

لەبیرت نەچێت لەنامەکەی پێشوو بەڵێنم لێوەرگرتوویت بچووکترین پەرچەکردارێک بۆ مەرگی من لەخۆت نیشان نەدەیت چوونکە ئەو کاتە ئەوانەی لەپەیوەندی من و تۆ ئاگادارن دەڵێن، شتێکیان لەنێواندا بووە و لەبەر ئەوەی نەمتوانیوە بەو سەرشۆڕییە ڕازی ببم، بەناچاری خۆم کوشتووە. دڵنیام تۆ حەز بەئابڕووچوونی من ناکەیت، دڵنیام.

ئازیزەکەم ماڵئاواییت لێدەکەم و لەبەر ئەوەی لەڕوانگەی کۆمەڵگا، من مارەبڕاوی کەسێکی دیکەم، تکا دەکەم دوای ئەوەی نامەکەت خوێندەوە، بیسووتێنە. ئەو کەسەی هەرگیز لەبیرت ناکات ڕۆئیا.

دوای خوێندنەوەی نامەکە بەتەواوی ساردبوومەوە،

ئێستا هەموو ڕاستییەکانم بۆ دەرکەوت و ڕوئیا بۆ ڕێزگرتن لەعەشقەکەمان، لەکاتێکدا لێخوڕی ترۆمبێلەکە بـووە، بەئەنقەست ترۆمبێلەکەی بەرەو دۆڵەکە بردووە و بەمەرگی خۆی و ئەحمەد، وەفاداری بۆ من سەلماندووە.

ئەو لەبەر ئەو بەڵێنەی سەبارەت بەعەشقەکەمان پێیدام و بۆ ڕێزگرتن لەهاوڕێیەتی پاکی نێوانمان، بەپێچەوانەی ئەوەی بیرم لێدەکردەوە، گیانی خۆی کردە قوربانی عەشقەکەی.

وەک خۆی نووسیبووی لەم ژیانە بێزارکەر و ماندووکەرە ماڵئاوایی کرد و بۆ هەمیشە ئاسـوودە بـوو، بـەڵام هێشتا بەخواستی ئـەو، مەحکوم بەزیندوو مـانـەوە بـووم، دەنگی لەقووڵایی ناخم دەزرنگایەوە کەدەیقیژاند:

گوڵە قەشەنگەکەم، ئەگەر سەد ساڵ دوای مەرگم، گۆڕەکەم هەڵبدەیتەوە و دڵم مابێت، دەبینی لەسـەری نووسراوە: تەنیا تۆم خۆشدەوێت.

مرۆڤ لەبەرابەر ڕووداوەکان چەندە لاوازە و لەبەرابەر عەشقێکی ڕاستەقینە چـەنـدە نـاتـەوان. مـرۆڤ هـەرکـات بڵێسەیەک لەعەشقی ڕاستەقینە دادەگیرسێنێت، ڕووداوەکان زۆر بەخێرایی خامۆشی دەکەن.

ڕوئیا بڵێسەیەک بوو لەعەشقێک کە بەمەرگی بۆ هەمیشە خامۆش بوو و من ئێستا لەتاریکی ڕەهای ژیانی بەفیڕۆچووم زیندوو ماومەتەوە تا ڕۆژێک لەتاریکی مەرگ لەناوبچم.

سوێند دەخۆم لەو ساتە تاریکە بەردەوام داوای مەرگم دەکرد، دەمویست بمرم و تا کۆتایی تەمەن ڕەنج نەبەم، بەڵام کاتێک بیری نووسینەکانی ڕوئیا دەکەوتمەوە، وشەی مەرگم فەرامۆش دەکرد، تا بەمشێوەیە ڕێزم لەخواستەکەی گرتبێت.

نازانم بۆ ڕوئیا بیری لەمن نەکردەوە، بۆ دوای مەرگی بەمشێوەیە بەتەنیا جێی هێشتم و بەمشێوەیە ویستی تا کۆتایی تەمەن لەڕەنجدا بم. لەو ساتە بەسوێیە، دەمتوانی چی بکەم، ئازیزترین کەسی ژیانم لەدەستدابوو، بۆ دەبوا بژیم؟

وەڵامی هەندێک لەپرسیارەکانم دەست نەدەکەوت جگە لەوەی لەسەر خواستی ئەو زیندوو بمێنەوە، ڕەنج بکێشم تا ئەو کاتەی دەمرم.

کاتێک ئەم بیرە بەمێشکمدا هات، بی ئیرادە و بەدەنگی بەرز دەستم بەگریانکرد، هەموو کەسانی دەوروبەر ئاوڕیان بۆ مێزەکەی ئێمە دایەوە، حەمید کاتێک ئەمەی بینی، قۆلی گرتم و دوای دانی پارەی ڕیستۆرانتەکە هاتینەدەر.

هیچ شتێک لەگەڵ پێشوودا نەگۆڕابوو جگە لەوەی ئیستا خۆم زیاتر بەبەدبەخت دەبینی و خۆشحاڵی کاتژمێرێکی پێشوو لەمندا نەمابوو. دڵم گیرابوو، چاوەکانم ڕەشکەوپێشکەی دەکرد، ئەگەر حەمیدم لەگەڵ نەبوایە، چەندجارێک دەدرام بەزەویدا.

ڕۆحم لەگەڵ کاتژمێرێکی پێشووتر، زەوی تا ئاسمان گۆڕا،

هیوام دەخواست خۆزگە ئەو ڕۆژە لەسووچی مەیخانە کەس بۆ هاوکاریم نەدەهات و کەس منی نەدەبردە نەخۆشخانە و لەوێ دەمردم، بەڵام بەداخەوە وانەبوو.

دوای مەرگی ڕوئیا، ژیان چ بەهایەکی بوو، مردنی ئەو بەوشێوە قارەمانانە، جارێکی دیکە حەماسەی عەشقە گەورەکانی لەمندا زیندوو کردەوە و هەستمکرد تەنانەت لەم ڕۆژگارەیشدا کەسانێک هەن، گیان بکەنە قوربانی عەشقێکی پاک و ڕاستەقینە.

ڕوئیا مرد و دڵی منیش بۆ هەمیشە شکا و هەستی ئەوەی دەبوا دوای ئەو زیندوویم، ئازاری دەدام. بەردەوام دەگریام و حەمید دڵنەوایی دەدامەوە. نازانم چۆن ڕێگەم بڕی بەڵام دڵنیابووم لەوەی حەمید بەتەواوی ئاگای لێمە.

حەمید نەیهێشت بگەڕێمەوە بۆ میوانخانەکە و منی بردە ماڵی خۆیان و شەوم لەوێ کردە ڕۆژ.

بەدرێژایی شەو بەئاگا بووم، بیرەوەرییەکانی ڕابردووم بیردەهێنایەوە و بەبیرهێنانەوەیان ئەوەندە ناڕەحەت دەبووم، خەریک بوو شێت ببم. دەمەوبەیان حەمید کاتێک نیگەران و ناڕەحەتی منی بینی، دوو دەنک حەبی خەوی پێدام و دوای خواردنی حەبەکان خەوم لێکەوت، خەوێکی قووڵ و بەئازار.

# ٩

زەمان بێ وەستان تێدەپەڕی، ڕۆحی نائارامی منیش گۆڕانی بەسەردا نەهات، تەنانەت گوزەری ڕۆژەکانیش نەیتوانی ڕووداوی مەرگی ڕوئیام لەبیر بباتەوە. چەندین ڕۆژ بیرم لەڕوئیا و کارەکەی دەکردەوە، بیرم لەو ساتە خۆشانە دەکردەوە کەپێکەوە بەسەرمان برد و لەوەی دوای ئەو، مەحکوم بەزیندوومانەوە بووم، ئازارم دەکێشا بەڵام بەداخەوە هیچ چارەیەکم نەبوو.

جیاوازی لەنارەحەتی سەرچاوەگرتوو لەمەرگی ڕوئیا، بێکاریش ئازاری دەدام، چیتر شەرمم دەکرد پارە لەکەس بەقەرز وەربگرم، بۆ ئەوەی سەرقاڵ بم، دووبارە بەدوای کاردا گەڕامەوە و بڕیارمدا هەرکارێکی شەرافەتمەندانەم دەستکەوت، بیکەم و بەمشێوەیە لەگەڵ سەرقاڵبوونم، خەرجییەکانی ژیانیشم دابین دەکرد.

دوای ئەوەی لەدۆزینەوەی کار لەدامەزراوە حکومییەکان بێهیوا بووم، بیرمکەوتەوە کەڵک لەمۆڵەتی شۆفێری وەربگرم

بــەڵام تــەنــانــەت وەک شــۆفــێریــش لــەهــیــچ شــوێــنێــک کــارم دەستنەکەوت. دەڕۆشتمە هەر شوێنێک، تەنیا یەک وەڵامم دەبیست:

پێویستمان بەکەسی دیکە نییە.

دوای ئەوەی لەهەموو شوێنێک بێهیوا بووم، بەڕێنیشاندانی بەڕێوبەری دامەزراوەی کاردۆزینەوە، بەڵگەنامەی خوێندن و کۆپی مۆڵەتی شۆفێرییەکەم بۆ وەزارەتی کار برد.

لەڕێڕەوی وەزارەتــی کــار، ژمارەیەکی زۆر چــاوەڕوان بــوون. منیش لەکۆتایی ڕیــزەکــەدا وەســتــام، کاتێکی زۆری خایاند تا سەرەم هات، کاتێک ویستم بڕۆمەژوور، خزمەتکاری بەردەرگاکە، ڕێگەی لێگرتم و بێ شــەرمانە وتی:

بەڕێز هێشتا سەرەی ئێوە نییە.

دواتــر لەکاتێکدا ئاماژەی بۆ گەنجێکی تەنیشتی کرد و من ئەو گەنجەم لەناو ڕیزەکەدا نەبینیبوو، وتی: سەرەی ئەم پیاوەیە، نەک ئێوە.

قسەکەی تووڕەی کردم و دەستم بەهات و هاوار کرد و بەپیاوەکەدا هەڵشاخامەوە.

بــەدەنــگی هــاتــوهــاواری مــن، یــەکێــک لــەفــەرمــانــبــەرانــی وەزارەتخانە لەژوورەکەی هاتەدەر و لەکاتێکدا بەتوڕەییەوە سەیری دەکردم، وتی:

ئەم دەنگە دەنگە چییە بەڕێز؟

خزمەتکارەکە ڕۆشتەپێش و لەکاتێکدا منی نیشان دەدا، بۆ فەرمانبەرەکەی ڕوونکردەوە و وتی: ئەم پیاوە لەبەر ئەوەی سەرەی نییە و دەیویست بەزۆر بڕواتەژوور و ڕێگەم لێگرتووە، بێهۆ ئەم دەنگەدەنگەی ناوەتەوە.

لەدرۆکانی ئەو پیاوە تورە بووم بەڕادەیەک ئەوەندەی نەمابوو شێت ببم.

لەتاو تورەیی خۆم دەلەرزیم، چەند کەسێکی ناو ڕیزەکەم کردە شایەت تا بەفەرمانبەرەکە بسەلمێنم من ڕاست دەکەم و وتەکانی ئەو پیاوە درۆیە.

بەڵام هیچکام لەوان لەترسی ئەوەی نەکا خزمەتکارەکە ببێتە هۆی ئەوەی ئیشیان دەستنەکەوێت، ئامادەنەبوون شایەتی بدەن.

کاتێک زانیم ئەو دەستەیە لەترسا قسە ناکەن، بەناڕەحەتی هۆکاری شایەتی نەدانی ئەوانم بۆ فەرمانبەرەکە ڕوونکردەوە و لەگەڵ ئەوەیشدا پێم وت ئەم خزمەتکارە بەوەرگرتنی بەرتیل لەژمارەیەک، پێش ئەوانی دیکەیان دەخات و من چوونکە ئامادە نەبووم بەرتیل بدەم و لەمافی خۆم بەرگریم کردووە، ئەم قاوەقیژەی دروستکرد.

وتەکان کاردانەوەی پێچەوانەی لەسەر فەرمانبەرەکە بوو بەشێوەیەک بەرۆکی گرتم و فڕێیدامە سووچێک، دواتر فەرمانیدا کاغەز بێنن و کاتێک هێنایان، داوایەکیان ئامادەکرد کەتیایدا هاتبوو من ئیهانەی کەسێکی شەریفم کردووە کەسەرقاڵی ئەنجامدانی ئەرکەکانی بووە و هەروەها بوومەتە هۆی پشێوی لەناو وەزارەتخانەکە. کاتێک ئەو بارودۆخەم بینی، هیچم نەوت و تەنانەت لەهاتنم بۆ ئەو وەزارەتخانەیە بەمەبەستی دۆزینەوەی کار پەشیمانبوومەوە.

ئەوان دوای ئامادەکردنی داواکە، منیان تەسلیم بەپۆلیس کرد. ئەفسەری کێشک بێ ئەوەی گرنگی بەوتەکانم بدات، دۆسیەیەکی ئامادە کرد و ڕادەستی بەڕێوبەرانی دادگای کردم.

لەدادگا ڕووداوەکەم وەک خۆی بۆ دادوەر گێڕایەوە. کاتێک زانی ڕاست دەکەم و مافیان خواردووم و تۆمەتیان بۆ هەڵبەستووم، بەزەیی پیامدا هاتەوە و دوای چەند پرسیار و وەڵامێک فەرمانی ئازادی بۆ دەرکردم.

کاتێک لەدادگا هاتمەدەر، دووبارە بێکار و سەرگەردان بووم. ماوەیەک بەناو شەقامەکاندا سووڕامەوە و دواتر گەڕامەوە بۆ میوانخانە، لەناوەوە دەرگای ژوورەکەم داخست و نوقمی دەریای ئەندێشە بووم. دەمویست بەهەرجۆرێک بووە، کارێک بۆ خۆم بدۆزمەوە.

لەناو دەریای بیرکردنەوەدا بووم لەناکاو خاوەن گاراژێکی ئاشنام بیرکەوتەوە. پێشتر ترۆمبێلەکەی باوکم لەو گاراژەدا پارک دەکرد و خاوەنەکەی زیاد لەڕادە ڕێزی دەگرتم. چەند جارێک وتبووی ئەگەر کارێک پێی بوو، سەردانی بکەم.

بەخێرایی لەمیوانخانەکە هاتمەدەر و ڕاستەوخۆ بەرەو گاراژەکە ڕۆشتم و لەناو ژووری کارەکەی چاوم پێی کەوت. خاوەنی گاراژ بەبینینی قیافەی شێواو و شپرەزەی من سەریسوڕما.

بێ پێشەکی بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕایەوە و داوام لێکرد ئەگەر دەتوانێت کارێکم بۆ بدۆزێتەوە.

پرسی:

ئایا دەتوانی کاری تەکسی بکەیت؟

بەخۆشحاڵییەوە وتم:

بەڵێ.

وتی:

زۆرباشە، بەیانی زوو وەرە بۆ گاراژ و تەکسییەکە وەربگرە.

لەگەڵ ئەوەیشدا برە پارەیەکی وەک قەرز پێدام تا سەروڕوخسارم چاک بکەم. شادوومان لەو کارەی دۆزیبوومەوە، ماڵئاواییم لێکرد و بۆ میوانخانە گەڕامەوە.

لەوەی توانیبووم دوای ماوەیەکی زۆر کارێک بدۆزمەوە، خۆشحاڵ بووم. بەمشێوەیە دەمتوانی لەبەیانییەوە کار بکەم و کۆتایی بەقۆناغی ناخۆشی ژیانم بهێنم.

ڕۆژی دواتر، سەروروخسارم چاککرد و زووتر لەڕۆژانی پێشوو لەخەو هەستام و بەرەو گاراژ بەڕێکەوتم. خاوەنی گاراژ تەکسییەکی باشی خستەبەر دەستم و دەستبەجێ سەرقاڵی ئیشکردن بووم.

هەرچەند سەرەتا زۆربەی ناوچەکانی شارم نەدەزانی، بەڵام هێواش هێواش بوومە ئاشنای شەقامەکان و بەگشتی لەکارەکەم ڕازی بووم.

## ١٥

شەش مانگ بەمشێوەیە تێپەڕی تا ئەوەی شەوێک کاتێک دەمویست بۆ نانی شەو بڕۆمە کەبابخانەیەک، لەبەردەم کەبابخانەکە، خانمێک کەچارشێوێکی ڕەشی لەسەردابوو، دەستی ڕأگرت، دەمویست بڕۆم نان بخۆم و نەمدەویست کەس سوار بکەم بەڵام نازانم بۆ بێ ئیرادە وەستام. ژنەکە دەستبەجێ سوار بوو بەڵام هێشتا سەد مەتر نەڕۆشتبووم کەچارشێوەکەی کۆکردەوە و خستییە ناو جانتاکەی. دواتر زۆر بەئارامی ڕوویکردە من و وتی:

سڵاو کاک بەهمەن.

بەسەرسورمانەوە ئاوڕم دایەوە و شەهلام بینی، بزەیەکی لەسەر لێو بوو و سەیری دەکردم. بەبینینی شادوومان بووم. داوایکرد تەکسییەکە ڕابگرم، ئەو کارەم کرد و هاتەپێشەوە و لام دانیشت.

قسە سەرەتاییەکانی ئێمە بەگلەیی کردن ئەو لەمن دەستپێکرد تا ئەوەی گەشتینە شوێنی مەبەست. داوایکرد

نانی شەو پێکەوە بخۆین. ڕازیبووم و ڕۆشتینە ماڵەکەی. منی بردە ژووری میوان و خۆی بۆ دروستکردنی خواردن ڕۆشتە چێشتخانەکە.

ئەم ژوورە زۆر بەجوانی ڕازابوویەوە. لەسەر مێزی میوان، ئینجانەیەک لەگوڵی مێخەکی سوور خۆی دەنواند، چەندین تابلۆی وێنەکێشان بەدیوارەکانەوە دەبینران و نووری کەمڕەنگی چراکان، جوانی و سەرنجڕاکێشی ژوورەکەیان چەند بەرابەر کردبوو.

شەهلا خواردنی ئامادە کرد و زۆر گەرموگوڕ خواردنەکەمان خوارد. بەرەو لای ئینجانەکە ڕۆشت و چڵێک گوڵی سوور هەڵگرت و لەکاتێکدا بەتەواوی لێم نزیکبوویەوە، گوڵە مێخەکە سوورەکەی پێدام و وتی:

بەهمەن ئەم گوڵە مێخەکە پێشکەش بەتۆ دەکەم، دەزانی گوڵی مێخەکەی سوور یانی چی... قسەکەی تەواو نەکرد و خۆی خستە ئامێزم. هەستمکرد بەپێشکەشکردنی گوڵەکە عەشقی خۆی بۆ دەربڕیم و لەبەر ئەوەی لەم ماوەدا بێ لانە و حاڵ بووم، پێشوازی ئەم عەشقەم کرد.

بەسەرهاتی عەشقی خۆم و ڕوئیام بۆ باسکرد و داوام لێکرد ئەگەر گرنگی بەڕابردووی من نادات، ببێتە خێزانم.

ڕازیبوو و چەند ڕۆژ دواتر لەکاتێکدا حەمید و ژمارەیەک

لەخزمەکانی شەهلا هاورێیەتیان دەکردین، ڕۆشتین و بەڕەسمی مارەم بڕی.

بەمشێوەیە ژیانی هاوبەشی ئێمە دەستیپێکرد و لەدایکبوونی منداڵەکەمان ژیانی گەرموگوڕتر کردین. لەبەر ئەوەی کەموکوڕی زۆرم لەژیاندا بینیبوو، نەمدەویست ئەو بەڵایە بەسەر هاوسەر و منداڵەکەیشم بێت، هەرچەندە باوکی شەهلا زیاد لەڕادە دەوڵەمەند بوو و دەیانجار شەهلا پێشنیاریکردبوو بڕۆینە کازەروون و لەوێ بژین بەڵام ئەم ژیانە سادە و لێوانلێو لەبەختەوەرییەم بەباشتر لەکۆشک و تەلاری ماڵی باوکی دەزانی.

بەو هەوڵانەی بۆ نەهێشتنی کێشەی ماددی و ڕۆحییەکانی ژیان دەمدا، لەماوەیەکی کەمدا ژیانمان باشتر بوو و من لەگەڵ هاوسەر و منداڵەکەم، ڕۆژانێکی خۆشمان بەسەر دەبرد. ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو تا ئەوەی ڕۆژێک بروسکەیەک لەکازەرونەوە هات کەباوکی شەهلا لەسەرەمەرگدایە و دەیەوێت بیبینێت. لەگەڵ گەیشتنی بروسکەکە، ئێمە شەو بەرەو کازەرون بەڕێکەوتین، بەڵام کەمێک درەنگ گەیشتین چوونکە باوکی شەهلا سێ کاتژمێر پێش گەیشتمان گیانیدابوو. بەیانی ڕۆژی دواتر ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنی باوکی شەهلا، بەبەشداری ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی کازەرون و خزم و

کەسوکار ئەنجامدرا. دوای هەفتەیەک مانەوە لەکازەرون بۆ تاران گەڕاینەوە.

بەمەرگی ئەم پیاوە دەوڵەمەندە، سامانەکەی بەشەهلا و خوشکەکەی گەیشت و ئەمە بووە هۆی ئەوەی شەهلا بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو بگۆڕێت. ئەو بەبیانووی ئەوەی من ئامادە نەبووم کارەکەم بگۆڕم و لەوماڵەدا بژیم کەئەو دەیویست بیکرێت، بیانوو گرتنەکانی دەستپێکرد. میراتەکەی باوکی بەڕادەیەک گێژی کردبوو، گرنگی بەهیچ شتێک و هیچ کەسێک نەدەدا و تەنانەت گوێی لەقسەکانم نەدەگرت. هەموو شەوێک بەمەبەستی قومار و هاونشینی لەگەڵ هاوڕێکانی دەرۆشت، لەو دانیشتنانە سەمای دەکرد، گۆرانی دەخوێند، مەشرووبی دەخواردەوە و سەرئەنجام شەوانە دوای دۆڕانی بڕەپارەیەکی زۆر، مەست و سەرخۆش بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوە.

لەوەی ببووە گوڵی مەجلیسی ژمارەیەک ژن و پیاوی قومارباز، شانازی بەخۆیەوە دەکرد و لەدەستخۆشی ئەو دەستەیە بۆ گۆرانیی خوێندن لەخۆی بایی بوو و کەمترین گرنگی بەژیانی من و مناڵەکەم نەدەدا.

لەگەڵ ئەوەیشدا چوونکە گومانم دەکرد سەرئەنجام ڕۆژێک دەست لەم کارە قۆڕ و شێتانەی هەڵدەگرێت، چاوەڕێی گەڕانەوەی ئەو بۆ ژیانێکی سادە و بەختەوەرانەی هاوشێوەی

ڕۆژەکانی یەکەمم دەکرد.

تەنیا بیرم لەخۆشی منداڵەکەمان دەکردەوە و ئەمە تەنیا بەگۆڕینی ڕێڕەوی ژیانی شەهلا ئەگەری بوو.

هەوڵەکانم بۆ گەڕاندنەوەی شەهلا بۆ داوێنی گەرمی خێزان بێ ئەنجام مایەوە. ئەو نەتەنیا ئامادە نەبوو، لەبەشداریکردن لەو شەونشینییانە دەستهەڵبگرێت، بەڵکو بەدامەزراندنی کوڵفەتێک و سپاردنی منداڵەکەمان بەو ژنە، زۆربەی شەوان تا بەیانی لەو دانیشتنانە دەمایەوە و بەربەیان، مەست و ماندوو دەگەڕایەوە. هەرچەند، زۆرجار داوام لێکرد دەست لەو کارانەی هەڵبگرێت، گرنگی بەوتەکانم نەدەدا. هەرچەند دەمزانی شەهلا لەو شەونشینییانە قومار دەکات، سەما دەکات و گۆرانی دەخوێنێت، بەڵام دڵنیابووم لەبەر منداڵەکەیشمان بووبێت، کارێک ناکات وەک خیانەت لەبەرچاوی بگرم و ببێتە هۆی سەرشۆڕی منداڵەکەمان بەڵام خۆزگە تا ئەم ئەندازەیە جڵەوم بۆ شل نەدەکرد و چارەنووسم نەدەگەیشتە ئێرە.

هەرگیز ئەو ڕۆژە لەبیرناکەم. بۆ چاککردنەوەی مەکینەی ماتۆرەکەم لەگاراژەکە مابوومەوە، میلەکان، کاتژمێر سێ و نیویان نیشان دەدا کەسەرایداری گاراژەکە بانگیکردم و وتی: تەلەفۆن ئێوەی دەوێت. خۆم گەیاندە دەفتەر و تەلەفۆنەکەم هەڵگرت. کەسێکی نەناسراو لەپشت تەلەفۆن هەندێک قسەی

کرد کەبۆ من شیاوی ڕازیبوون نەبوو. ئەم کەسە بێ ئەوەی خۆی بناسێنێت، ناونیشانی پێدام و تەلەفۆنەکەی داخستەوە.

حەپەسابووم، تەلەفۆنەکەم لەدەست کەوتەخوار. سەرایەدارەکە هات و هەڵیگرتەوە ووتی: حاڵتان باش نییە، وتم: باشم. عارەقێکی سارد کەوتە سەر ناوچاوم، بەدەست پاکمکردەوە، گاراژم بەجێهێشت و ڕۆشتمە ئەو شوێنەی پیاوی نەناسراو ناونیشانەکەی پێدام.

ئەو ماڵەم زۆر بەباشی دەناسی. ئەگەر پیاوی نەناسراو، ناونیشانەکەی بەڕاستی پێدابێتم، دەبێت چەند سات دواتر هاوسەرەکەم لەماڵێک، کەماڵی باوکی حەمید بوو و چەند ڕۆژ پێش کرێچییەکە چۆڵی کردبوو، بێتەدەر.

بۆ من شیاوی ڕازی بوون نەبوو خۆشەویستترین هاورێم، حەمید، لەگەڵ هاوسەرەکەم، دایکی منداڵەکەم، لەم ماڵەدا بەتەنیا بن، نە، شتی وا ڕاست نەبوو و نەمدەتوانی باوەڕ بکەم. بەخۆم دەوت خۆزگە قسەکانی ئەو پیاوە نەناسراوە درۆ بێت و خۆزگە ئەو تەلەفۆنە بەهۆی ڕق و کینەی کەسێکەوە بێت کەمەبەستی لەناوبردن و تێکدانی خێزانێکە.

حەزم دەکرد ڕەگ و ڕیشەی گومان لەناخمدا وشک بکەم. دەمتوانی بیر لەهەموو شتێک بکەمەوە جگە لەخیانەت لەلایەن شەهلا و حەمید. چۆن دەمتوانی ڕازی ببم خۆشەویستترین

هاوڕێی ژیانم، کەسێک کە لەهەموو بارودۆخێکدا هاوڕێیەتی کردووم و ڕۆژە باش و تاڵەکانم لەگەڵ ئەو بەسەر بردووە، خیانەتم لێبکات.

چۆن دەمتوانی باوەڕ بکەم شەهلای داوێنپاک، بەلاڕێدا چووە، نە، نەمدەتوانی باوەڕ بکەم.

ئەگەر ئەوە ڕاست بێت، چیتر مرۆڤ لەژیاندا دەتوانێت باوەڕ بەکێ بکات، نە، بەدڵنیاییەوە ئەم وتانە درۆیە و کەسی نەناسراو، بەهۆی دوژمنایەتییەوە، ئەم بابەتەی پێ وتووم.

لەخوا پاڕامەوە لەبەر منداڵەکەیشمان بێت، ژیانمان ڕزگار بکات و ڕێگە نەدات هاوسەرە باش و میهرەبانەکەم، لەگێژاوی بەدبەختیدا ڕۆچێت و بڕواتە سەر ڕێگەیەک کەدەرفەتی گەڕانەوەی نییە.

هێشتا دۆعا کردنەوەکەم تەواو نەبووبوو، دەرگای ماڵەکە کرایەوە. بەخێرایی خۆم لەپشت باجەی تەلەفۆنی سەرشەقامەکە شاردەوە تا نەبینرێم. ژنێک بەچارشێوی ڕەش، لەکاتێکدا ڕوخساری بەتەواوی داپۆشیبوو، لەوێ هاتەدەر و دوای ماڵئاوایی کردن لەحەمید، سوار تەکسی بوو. دەرگای ماڵەکە دووبارە بەسترایەوە و تەکسی بەڕێکەوت. ترۆمبێلێکم بەکرێگرت و داوام لێکرد شوێن تەکسییەکە بکەوێت. ئەو کەپەرێشانی منی بینی، بەداواکەم ڕازی بوو و شوێن تەکسییەکە کەوت.

تا ئەو ساتەی تەکسییەکە لەبەردەمماڵەکەمان نەوەستا، گومانم دەکرد ئەو ژنە هاوسەری من نییە بەلاّم کاتێک تەکسی لەبەردەم ماڵی خۆمان وەستا، شەهلام بینی لەکاتێکدا چارشێوەکەی دەخستە ناو جانتاکەی، لەتەکسییەکە دابەزی. ڕاستییەکانم بۆ دەرکەوت. ڕاستییەک کەهەرگیز نەمدەتوانی پێی ڕازی ببم.

ژیانم بوو بەدۆزەخ. بەتەواوی بوونی خۆم هەستم بەخیانەتی شەهلا و حەمید کرد و بۆ ژیانی مناڵە پاک و بێ تاوانەکەمان کەبەرهەمی عادەتی شەهوەت پەرەستانەی ئێمەبوو، داخم و کەسەرم خوارد، بەلاّم دووبارەلەبەر منداڵەکەمان کەدەبوا لەداهاتوودا لەناو کۆمەڵگا بژی، خۆم کۆنترۆڵکرد. سوپاسی لێخوڕی ترۆمبێلەکەم کرد و دابەزیم.

ڕاستی لەئێوە دەپرسم دادوەرە بەڕێزەکان، ئەگەر ئێوە لەجیاتی من بوون، چیتان دەکرد؟ ئایا هاتوهاوارتان دەستپێدەکرد، ئایا دەستبەجێ دەتانکوشت یا قسەتان نەدەکرد کەهاوسەرەکەتان خیانەتی لێکردوون و ڕێگەتان دەدا داهاتووتان وێران ببێت.

ئێوە، بەڕێز داواکاری گشتی، ئەگەر لەجیاتی من دەبوون و ئەو دیمەنەتان دەبینی، ئایا بێدەنگ دەبوون و ڕێگەتان دەدا ئابڕوو و شەرەفتان بڕوات، یا لەتاو نارەحەتی شێت دەبوون

و دەتانقیژاند و بەهەموو کەسێکتان دەوت کەهاوسەرە باش و میهرەبانەکەتان، خیانەتی لێکردوون.

ئێوە، بەڕێز داواکاری گشتی، ناتوانن هەست بەڕەنج و خەمی پیاوێک لەم دیمەنەدا بکەن مەگەر ئەوەی خۆتان بخەنە جێگەی ئەو، تازە ئەگەری هەیە بڵێن تۆ هەڵە بوویت و دەبێت دەرفەتی بەرگری بەهاوسەرەکەت بدەیت و ئەمەیش بۆچوونی منە. بەڵێ، دەبێت دەرفەتی پێبدەیت تا قسە بکات و ڕاستییەکان دەرکەوێت. ئەگەری هەیە ئەم کارە بۆ تێکدانی خێزانەکەی ئێمە ئامادە کرابێت.

کەواتە نابێت پەلە بکەیت، بەهەمانشێوە کەمن پەلەم نەکرد و ئێوە دڵنیام دەتانەوێت بزانن پەچەکرداری من چی بوو. کەواتە باش گوێبگرن دواتر بڕیار بدەن.

دەستبەجێ دوای ئەوە شەهلا ڕۆشتەژوور، ڕۆشتمەژوور. بەبینینی من ڕاچڵەکا و ترس سەرتاپای گیانی داگرت. بەئاشکرا دەلەرزی. هەرگیز گومانی نەدەکرد لەو ساتەدا ڕووبەڕووی من ببێتەوە. لەکاتێکدا بەتەواوی تووڕە بووبووم، هاوارم کرد:

هیچوپووچ، لانیکەم بەزەییت بەمناڵەکەماندا بێتەوە، مناڵێک کەتۆی دایکیت و من باوکی. مەگەر خۆت پێشنیاری زەواجت پێنەکردم، مەگەر خۆت گوڵە سوورەکەت پێشکەش نەکردم، مەگەر بەڵێنت نەدا هاوسەرێکی شیاو و وەفادار بیت، کەواتە

بۆ ژیانمان لەناو دەبەیت؟

بۆ؟ وەڵام بدەرەوە، ئاخر بۆ نزیکترین هاورێی منت بۆ خیانەتی خۆت هەڵبژارد؟ چوونکە ترۆمبێلی هەیە، چوونکە شیکپۆشە، چوونکە لەبنەماڵەیەکی دەوڵەمەندە؟ یا چوونکە پیاوێکی خۆشڕابوێرە؟ کامیان؟

بۆ دەستەیەک لەئێوەی ژن ئەوەندە پەستن دەبنە هۆی ئەوەی چیتر هیچ پیاوێک بڕوا بەهاورێکەی نەکات، ئاخر کاتێک نزیکترین هاورێم، کەسێک کە لەمناڵییەوە پێکەوە گەورە بووین وبەشداری هەموو خەم و خۆشییەکانم بووە، خیانەتم لێبکات، دەبێت چاوەڕێی چی لەکەسانی دیکە بکەم؟

بەدڵنیاییەوە هیچکەس و تۆ و کەسانی وەک تۆ تۆوی ئەم بێ بڕواییە لەئێمەدا دەچێنن. بۆ بەم کارەتان دەبنە هۆی لەناوبردنی هاورێیەتییە پاک و بێگەردەکان؟ ئەگەر هاورێیەتی بەمشێوەیە، بەنەفرەت بێت و ئەگەر وا نییە، بۆ لەشانسی مندا وای لێهات؟ بۆ؟ پێم بڵێ بۆ؟

تەنیا بێدەنگ بوو، سەری خستەخوار و فرمێسکی لەچاو دەباراند. بەئاشکرا شەرمم لەناوچاویدا بینی. حەزم دەکرد بکەوێتە بەرپێم و بۆ گوناحەکەی داوای بەخشین بکات و بەڵێن بدات، دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی ئاسایی خۆی چوونکە هێشتا لەبەر خاتری منداڵەکەمان توانای بەخشین و

بەردەوام بوونی ژیانم هەبوو.

لەبەر ئەوە بەدەنگی ئارام و هاوشێوەی مۆجیاری کردن پێم وت:

سەیرکە شەهلا، ڕابردوو ڕۆشت، وەرە و لەبەر منالەکەمان بگەڕێرەوە بۆ باوەشی ژیان. دڵنیام لەکارەکەت پەشیمانی، وانییە؟

وەک کەسێک لەخەو بەئاگا بێتەوە، سەری بەرز کردەوە و وتی:

ئەگەر پەشیمانبم، دەتوانم چی بکەم؟

بەڵێن بدە کارەکانی ئێستات دووبارە ناکەیتەوە.

یانی دەمبەخشیت؟

ئەگەر لەقوولایی دڵتەوە بەڵێن بدەیت، بۆ ڕزگارکردنی تۆ لەناوزڕان و لەبەر داهاتووی منالەکەمان دەتبەخشم.

بەڵێن دەدەم بەهمەن، سوێند دەخۆم بەخوا، لەمەودوا هاوسەرێکی وەفاداری تۆ و دایکی مێهرەبانتر بۆ منالەکەمان بم.

لەکاتێکدا خوڕخوڕ دەگریا، خۆی خستە باوەشم و بەوشەی پچڕ پچڕ، وتی: چەندە میهرەبانیت بەهمەن، تۆ چەندە گەورە و ڕێزداریت، چەندە.

لەوەی توانیبووم بەعاقڵانەترین شێوە شەهلا بۆ سەر

ڕێگەی ڕاست بگەڕێنمەوە، ویژدانم ئاسوودە بوو و ئەم ئاسوودەییە، دابینکەری بەختەوەری ژیانی خێزانەکەم بوو.

لەوەی جارێکیتر بیرەوەرییە خۆشەکانی سەرەتاکانی ژیانی هاوبەش، لەبنەماڵەکەماندا گیانی دەگرت، هەستم بەشادوومانی دەکرد.

شەهلا دووبارە بۆ ژیان گەڕایەوە و ئەمە ئەو شتە بوو لەدڵەوە ئارەزووم دەکرد.

## ١١

لەم کاتەدا تۆمەتبار کەهیلاک بەرچاو دەکەوت، چەند ساتێک بێدەنگ بوو. خەمێکی قووڵ لەچاوەکانی دەبینرا و لێوی وشک بووبوو. دەتوت چیتر توانای نییە پاشماوەی بەسەرهاتەکەی بگێڕێتەوە.

بێدەنگی باڵی بەسەر هۆڵی دادگاییەکە کێشابوو. هەمووان هەناسەیان لەسنگدا زیندانی و چاوەڕوانی بیستنی پاشماوەی بەسەرهاتەکە بوون.

لەم کاتەدا سەرۆکی دادگا، لەکاتێکدا بەئارامی سەری تەکان دەدا، ڕوویکردە تاوانبار و وتی:

تکایە بەردەوام بن.

تاوانبار داوای ئاوی کرد. ئاویان بۆ هێنا و خواردییەوە و لەکاتێکدا بەتەواوی نارەحەت بەرچاو دەکەوت، پاشماوەی بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە:

لەو ڕۆژە بەدواوە بۆ ماوەی پێنج مانگ ژیانمان ئارام بوو. شەهلا بەتەواوی گۆڕا بوو و تەنانەت باشتر لەڕابردوو

خزمەتی ماڵەکەی دەکرد. شەوانە کاتێک دەگەڕامەوە، دەمبینی سەرقاڵی گەمەکردن لەگەڵ منداڵەکەمانە. بینینی ئەم دیمەنە شەکەتی و ماندوویەتی جەستەی لەبیر دەبردمەوە. دووبارە بەختەوەریم بەدەستهێنابوو. ئەم بارودۆخە بەردەوام بوو تا ئەوەی شەوێک خاوەنی گاراژەکە پێی وتم بەمەبەستی کارێکی گرنگ بەرەو ئابادان دەڕوات و منیش دەبێت لەگەڵی بڕۆم. لەبەر ئەوەی خەیاڵم ئاسوودە بوو، ڕەزامەندیم نیشاندا و هەمانشەو، شەهلام ئاگادار کردەوە. بەیانی ئەو ڕۆژە لەگەڵ خاوەنی گاراژەکە بەرەو ئابادان بەڕێکەوتین.

نزیکەی دوو حەفتە لەمانەوەی من و خاوەن گاراژ لەئابادان تێدەپەڕی کەئاگاری کردمەوە بەمەبەستی کارێک دەبێت بڕۆینە خورەمشەهر و تا شەش ڕۆژی دیکە لەتاران دەبین.

لەوەی بۆ تاران دەگەڕامەوە شادوومان بووم. بەبرووسکە شەهلام ئاگادار کردەوە کەتاشەش ڕۆژی دیکە لەتاران دەبم. دواتر بڕێک دیاریم بۆخۆی و منداڵەکەمان کڕی بەڵام بەڕێکەوت کاری خاوەن گاراژەکە لەخورەمشەهر تەنیا دوو ڕۆژی خایاند و ئێمە چوار ڕۆژ زووتر بۆ تاران گەڕاینەوە.

دوای ماڵئاوایی لەخاوەن گاراژ، بەتەکسی بەرەو ماڵەوە بەڕێکەوتم. لەوەی دوای چەند ڕۆژ دووری شەهلا و منالەکەمانم دەبینی، شادوومان بووم بەڵام نازانم بۆ لەخۆوە نیگەران

بووم وەک ئەوەی پێشبینی ڕووداوێکی شووم و نەخوازراوم کردبێت. کاتێک گەیشتمە مەبەست، پارەی تەکسیمدا و زەنگیماڵەکەمانم لێدا، بەڵام کەس دەرگای نەکردەوە. چەند جارێک زەنگم لێدا بەڵام کەس دەرگای نەکردەوە.

نیگەران بووم و بەگومانی ئەوەی شەهلا و کوڕەکەم بۆ کڕین یا کارێکی دیکە لەماڵ چوونەتەدەر، بڕیارمدا بەدیوارەکەدا سەرکەوم و بڕۆمە ژوور. لەم کاتەدا پۆلیسێکی ماتۆرسوار لەبەر دەرگا وەستا و کاتێک زانی من خاوەن ماڵەکەم، نامەیەکی لەدادگاوە پێدام کەبەناونیشانی شەهلا نێردرابوو. دوای وەرگرتنی واژۆ، ماڵئاوایی کرد و ڕۆشت.

کاتێک نامەکەم کردەوە، لەڕاستییەکی تاڵ ئاگادار بوومەوە. کوڕەکەم لەناو ئاوی حەوزی ماڵەکەمان خنکابوو و لێکۆڵەر بۆ هەندێ ڕوونکردنەوە، شەهلای بانگێشتی دادگا کردبوو.

ناتەوان و بێهێز خۆم گەیاندە حەوشێکە، دیارییەکانم هەڵدایە ناو حەوشێکە، بەسەر دیوارەکەدا هەڵگەڕام و ڕۆشتمە ژوور.

هەموو شوێنێک کپ و بێدەنگ بوو. لەسەر تاقەکە وێنەیەکی کوڕەکەم دەبینرا کەپێدەکەنی. واقوڕماو سەیری وێنەکەم کرد، تەنانەت نەمدەتوانی بگریم. لەسووچێکی ژوورەکە، قەرەوێڵەی کوڕەکەم خاڵی بوو. هەستمکرد لەدەرگا و دیوارەوە خەم دەبارێت.

گومانی ئەوەی هەرگیز دەنگی گریان یا پێکەنینی نابیستم، ئاگری تێبەردەدام. ئەم ماڵە بۆ هەمیشە بێدەنگ بووبوو و ئەم بێدەنگییە، بۆنی مەرگی لێدەهات. دەبوا ناباوەڕأنە بەم ڕاستییە تاڵە ڕازی ببم کەکوڕەکەم مردووە، کوڕێک کەهەموو هەوڵێکی من بۆ بەختەوەری ئەو بوو، بەڵام ئێستا چۆن دەمتوانی بێ ئەو درێژە بەژیان بدەم.

ڕۆشتمە لای پەنجەرەکە، سەیری کاتژمێرەکەم کرد. یانزەی شەو بوو، هیچ هەواڵێکی شەهلام نەبوو. سەیری ئاوی حەوزەکەم دەکرد کەکوڕەکەمی تیاخنکا بوو.

مانگ تیشکی خۆی لەقووڵای ئاوی حەوزەکە کردووبە چەندین پارچە. لای دیوارەکە پشیلەیەکی سپی هەڵتووتکابوو و سەیری دیارییەکانی دەکرد.

بیری تێکەڵ و پێکەڵ هێرشیان دەکردە سەر مێشکم. جارێکیِ دیکە بۆ ڕابردوو گەڕابوومەوە، بیرەوەرییە خۆشەکانی عەشقی ڕوئیا، مەرگی تاڵی ئەو، ژیانی هاوبەش لەگەڵ شەهلا و ژیانی ئارامی سەرەتا و مەرگی کوڕەکەم و ئاوی حەوزەکە کەبکوژی کوڕەکەم بوو، بکوژێک هەرگیز دادگایی ناکرێت.

ماوەیەکی زۆر بیرم کردەوە، کاتێک هاتمەخۆم، کاتژمێر لەسێ و نیو تێپەڕیبوو. ڕۆشتمە هۆڵەکە و لەسەر قەنەفەیەک پاڵکەوتم. جگەرەیەکم داگیرساند، چەند مژێکم لێنەدا کەدەنگی

سووڕانی کلیلم لەناو قوفڵی دەرگاکە بیست.

ساتێک دواتر دەرگا کرایەوە و شەهلا بەئارامی هاتە ناو هۆڵەکە. سەرەتا هەستی بەبوونی من نەکرد بەڵام کاتێک گڵۆپەکەی داگیرساند و منی بینی، وشک بوو.

بەسەرنجدان بەو بروسکەی بۆم ناردبوو، چاوەڕێ نەبوو لەئێستادا بمبینێت. نزیکبوویەوە، کەوتەسەرچۆک و دەستیکرد بەگریان. بەڵام لەناکاو گریانی وەستاند و وتی:

من بەکەڵکی تۆ نایەم، تەڵاقم بە. پیاوێکی دیکەم خۆشدەوێت، من عاشقی حەمید بووم.

شێت بووم، بەدژواری خۆم کۆنترۆڵکرد و پرسیم:

ئایا ئەویش تۆی خۆشدەوێت.

گرنگ نییە، هەر ئەوەی من خۆشمدەوێت بەسە، تۆ دەبێت تەڵاقم بەیت چوونکە چیتر بەکەڵکی ژیانی تۆ نایەم.

نازانم لەچ حاڵێکدا بووم، تەنانەت مەرگی منداڵەکەمانم لەبیر کرد. لەکاتێکدا گرنگیم بەقسەکانی نەدەدا، وتم:

ئەگەر تەڵاقت بدەم، مناڵەکەمان چی بەسەر دێت؟.

پێکەنی و بێ لەبەرچاو گرتنی حاڵی من، وتی:

کام مناڵە، ئەو مردووە.

شۆک لێیدام، وەک فیشەکەشێتە لەشوێنەکەم بەرزبوومەوە. جەستەم دەلـەرزی. خوێن بـەرچـاوی گرتبووم و توانای

کۆنترۆڵکردنی خۆم نەبوو. وەک مارێکی بریندار پەلامارمدا. نەمدەزانی چی دەکەم. تەنیا دەزانم دەستم لەقژی ئالآند. بۆنی مەشرووبی لێدەهات، دەپاڕایەوە بەڵام لەحاڵێکدا نەبووم گرنگی بەپاڕانەوەکانی بدەم. بێزارییەکی سەیر بەسەرما زاڵ بووبوو. لەو ساتەدا هەموو شتێکم بە لەناوچوو دەبینی. چیتر ژیان مانای خۆی لەدەستدابوو.

لەتوڕەییدا دەلەرزیم. پەنجەکانم لەدەوری ملی گیرکرد و بەهەموو هێزمەوە، قوڕگیم گووشی. ڕەنگی شینبوویەوە. چاوەکانی حاڵەتێکی سەیریان بەخۆوە گرت، جەستەی وەک لقێکی شکاو، چەمایەوە. دەستم لێهەڵگرت و لەکاتێکدا نیگەران و پەرێشان بووم، لەماڵ هاتمەدەر و دوای ماوەیەک گەڕان بەناو شەقامەکاندا، خۆم تەسلیمی بنکەی پۆلیس کرد.

*****

پاشماوەی بەسەرهاتەکە خۆتان لێی ئاگادارن. ئەگەر تا دووایین سات بێدەنگ بووم و هیچم نەوت تەنیا لەبێ ئابڕووی دەترسام بەڵام چوونکە پێداگری زۆر کرا، ئەوەی نەمدەویست خەڵک بیزانن، باسمکرد و بەمشێوەیە ئابڕووی خۆم برد.

دوای گێڕانەوەی بەسەرهاتی ژیانم، پیاوێکم کەچارەنووسی نادیارە، چیتر باش و خراپی ژیان لای من مانای نییە. ژیان

تێکی شکاندم و لەناو کۆمەڵگا لەناوی بردم. ئەمڕۆ بۆ ئەوەی وتم، هیچ بەڵگەیەکم نییە و داوایش ناکەم ئێوە بەوتەکانم ڕازی ببن بەڵام هیوادارم لانیکەم نهێنی بێدەنگبوونی منتان بۆ ڕوون بوو‌بێتەوە.

هەمیشە لەئابڕووتکان دەترسام و ئەمڕۆیش کاتێک ئەو ڕاستییانەم باسکرد، ئارەزوو دەکەم بمرم و لەم ژیانە پووچە ڕزگارم بێت.

من تاوانباری کوشتنم و دان بەتاوانەکەی خۆمدا دەنێم، بەڵام بەهەرحاڵ مرۆڤم، مرۆڤێک کە لەکۆمەڵگا دوورخراوەتەوە و پیاوێکی تەنیایە، کوڕەکەی مردووە، عەشقەکەی مردووە، ژنەکەی مردووە وسەرئەنجام خۆیشی دەمرێت.

حەز دەکەم ئێوە کەمنتان دادگایی کرد و لەڕاستیدا سەرۆکایەتی کۆمەڵگاتان لەدەستدایە، بزانن ئەگەر گەنجێک دەبێتە قوربانی بەهۆی پەروەردەی هەڵە و ژینگەی ناتەندروستەوەیە، تەنانەت ئێوەیش ناتوانن بانگەشەی ئەوە بکەن مناڵەکانتان بۆ ئەمڕۆ یا بەیانی کۆمەڵگا پەروەردە کردووە. کەواتە ڕێگەی ژیانیان فێر بکەن بەو شێوەی ژینگە دەخوازێت، چاونەترسانە باسی عەشق، ژیان و هەموو شتێکیان بۆ بکەن و ئەو پەردانە لەناو ببەن کەئێوە و ئەوان جیا دەکاتەوە.

ئەگەر عاشق بوون، ڕێز لەعەشقەکەیان بگرن و ئەگەر نارەحەتی بەرۆکی پێگرتن، هەوڵ بدەن هاوکاریان بن تا چارەنووسی منیان پێنەبڕێت.

ئەمڕۆ هاوشێوەی لقێکی شکاوم کەهەرکات ئەگەری وشکبوونم هەیە، بەڵام ئێوەن دەبێت لەشکانی لقە گەنجەکان ڕێگری بکەن و بیانپارێزن.

سوپاسی هەمووتان دەکەم کەگوێتان لەوتەکانم گرت و ئازادانە دەتوانن بڕیاری خۆتان سەبارەت بەمن بدەن.

بەرهەحاڵ زیندان یا سێدارە بۆ من وەک یەکە، داوایشتان لێدەکەم کەمترین بەزەییتان بەمندا بێتەوە چوونکە ئەگەر حوکمەکەتان سێدارە بێت خۆشحاڵتر دەبم و بەمشێوەیە لەتەمەنێک ئازاب کێشان و ڕەنج بردن لەسووچی زیندان یا باشتر بڵێم لەهەزارجار مردن و زیندووبوونەوە، رزگارم دەکەن.

چیتر قسەم نییە و ئامادەی بیستنی بڕیاری دادگام.

***

کتوپڕ دەنگەدەنگەی ئامادەبووان، بێدەنگی دادگای شکاند. تاوانبار لەکاتێکدا فرمێسک بەچاویدا دەهاتەخوار، لەسەر کورسییەکەی دانیشت. سەرۆکی دادگا، کۆتایی دانیشتنەکەی ڕاگەیاند و دادوەرەکان بۆ دەرکردنی حوکم، کۆبوونەوە.

دانیشتنی نهێنی دادوەرەکان چوار کاتژمێری خایاند. دواتر لەکاتێکدا ماندوویەتی بەڕوخساری هەموویانەوە دەبینرا، هاتنەدەر و دوای سکرتێری دادگا، بڕیاری دادوەرەکانی ڕاگەیاند کەبریتیبوو لەپانزە ساڵ زیندان و کاری قورس.

تاوانبار لەکاتێکدا بەتەواوی خوێنسارد بوو، ژێر وەرەقەی حوکمەکەی واژۆ کرد و بێ ئەوەی داوای تێهەڵچوونەوە بکات، لەلایەن پۆلیسەکانەوە ڕەوانەی زیندانکرا.

هەواڵی مەحکومبوونی بەهمەن بەمانشێتی گەورە لەڕۆژنامەکانی ئەو شەوەدا بڵاو بوویەوە. زۆربەی ئەو کەسانەی بەسەرهاتی بەهمەنیان خوێندەوە، بێ ئیرادە گریان. ئەم ڕووداوەش دوای ماوەیەک لەبیرکرا هەرچەند چارەنووسی تاڵی بەهمەن بەمە کۆتایی نەهات. ئەو تەنیا چەند مانگ لەزینداندا مایەوە و بەرەبەیانی ڕۆژێکی گەرمی هاوینە، پۆلیسەکان، جەنازەی شینبووی بەهمەنیان لەسووچی سلولەکەیدا دۆزییەوە. جەنازەکەیان بەمەبەستی پشکنین بۆ پزیشکی دادوەری برد.

سەیرتر ئەوەی کاتژمێرێک پێش گواستنەوەی جەنازەی بەهمەن، جەنازەی گەنجێکی دیکەیشان بۆ پزیشکی دادوەری هێنا کە لەنەخۆشخانەیەکی دەروونی خۆی هەڵواسیبوو. جەنازەی دووەم، جەنازەی حەمید، هاوڕێ نزیکەکەی بەهمەن بوو.

لەو لێکۆڵینەوەی سەبارەت بەمەرگی حەمید کردمان، خزمەکانی وتیان، ئەو دوومانگ پێش بەترۆمبێلە ئاخیر مۆدێلەکەی لەگەڵ هاوسەرەکەی کەتەنیا دوو ڕۆژ بەسەر ئاهەنگی گواستنەوەکەی تێدەپەڕی، بۆ بەسەر بردنی مانگی هەنگوینی بەرەو شمال (باکور) دەڕۆن. لەڕێگادا تووشی کارەساتی ترۆمبێل دەبن، هاوسەرەکەی دەمرێت و خۆیشی بریندار و دواتر دەحەپەسێت و شێت دەبێت و چەند ڕۆژ دواتر لەنەخۆشخانە، خۆی هەڵدەواسێت.

بەمشێوەیە سروشت، تۆڵەی لەناوبردنی ژیانی بەهمەنی لەحەمید وەرگرتەوە و ئەوی بەسزای کردەوەکانی گەیاند.

جەنازەی حەمیدیان بەکەسوکاری سپارد. چوونکە هیچکام لەکەسوکاری بەهمەن بۆ وەرگرتنی جەنازەکەی نەهات، بەترۆمبێلی فریاکەوتن گواستییانەوە تا لەگۆڕستانی گشتی بەخاکی بسپێرن.

کاتێک ترۆمبێلی هەڵگری جەنازەی بەهمەن لەپزیشکی دادوەری دەهاتەدەر، نم نم باران دەباری، نازانم ئەگەری بوو ئەم دڵۆپە فرمێسکەکانی ڕوئیا بێت کەهاوشێوەی باران ماڵئاوایی لەخۆشەویستەکەی دەکرد بۆ ئەوەی سووکنایی بەدڵی سووتاوی بدات.

ئـەویـان بـردە گۆرسـتـان و چـەنـد گۆڕهـەڵکـەنـی پیر، جەنازەکەیان بەخاک سپارد بەڵام کەسی نەبوو یەک دڵۆپ فرمێسکی بۆ بڕێژێت یا چەپکێک گوڵ لەسەر گۆڕەکەی دابنێت.

ئەو تەنیای تەنیا بوو...

ئەگەری هەیە وەک خۆی دەیوت:

منالّەکەی مردووە، عەشقەکەی مردووە، ژنەکەی مردووە و سەرئەنجام خۆیشی مردبوو....

# لەمشەو فرمێسکێک دەڕژێت

”

کاتێک نیگامان بەریەک کەوت، هەستمکرد دڵم دەلەرزێت، لەبەرابەر هێزی عەشقی ئەو بێهێز دەبووم. بەخۆم دەوت لەبەرامبەر ئەو هەموو پاکی و خۆشەویستییەی ناخی ڕوئیا، ژیانیش گرنگ نییە. بەخۆشحاڵییەوە دەستم خستە ناو قژی، دواتر سەبارەت بەدابینکردنی پارەکە، درۆیەکم پێکەوەنا و وتم: بەهۆی یەکێک لەهاوڕێکانمەوە پارەکەم دابینکردووە. لەکاتێکدا بەگومانەوە سەیری دەکردم، دەیویست بزانێت پارەکەم چۆن و لەکوێ بەدەست هێناوە...

3000


کتێبخانەی گۆڵدن بووک
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
07701598762 - 07501444434
Goldenbook @ktebfroshe_warzer
GOLDEN BOOK